زنجیرەی بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی -٩-

# ڕەنگ لە زمانی کوردیدا



## لێکۆڵینەوەیەکی لیکسیکی سیمانتیکییە





د. مستەفا زەنگنە

٢٠٠٢

# ڕەنگ لە زمانی کوردیدا
## لێکۆڵینەوەیەکی لیکسیکی سیمانتیکییە

د. مستەفا زەنگنە

هەولێر ———————————— ٢٠٠٢

# هەڵوێستەیەك

یەکێك لە ڕاستی و دروستییەکانی تۆژینـەوەی ئـەکادیمی تۆکمـەو سـەرکەوتوو ئەوەیە کە هەوڵی ئەوە بدات، زانیارییەکی شاراوە یان پەی پێنەبراوە بخاتـە ڕەوت و شێوازێکی کارەکی نوێوە، بـۆ ئـەوەی خزمـەتێك بگەیـەنێ، کەپێشـتر بـەلایدا نەچوونە. بەبۆچوونی من ئـەم دوو ئامانجەلـەم کتێبـەدا هاتوونەتـە دی. ئەمـەش بەتایەندیی هەر بابەتێکی سەرکەوتوو لە قەڵەم ئەدرێت بەتایبەتی ئەگەر ئـەنجامی کۆششی کەسێك بێت بنەماکانی تۆژینەوەی ئەکادیمی ڕەچاوبکات و خۆشی وزەیەك بێت لە ناوئەو تواناناینەدا کە کڵپەی دەروونی خوێنەر دا ئـەمرکێنن و چـەند وەڵام ئەدەنەوەو چەندین پرسیاریش دەوورژێنن. کتێبخانەی کوردی چـاوەڕێی ئـەم جـۆرە بەرهەمانەیـە بەتایبـەتی ئـەوە خوێنـەرە بـەڕێزانی کـە زمـانی بیـانی نـازانن و پێویستیان بەسەرچاوەی زانستی دەبێ. لەبەرئەم هۆیانە، لەدایکبوونی بەرهەمێکی ئاوا لەکاتێکدا بەردیدی خوێنەری کورد دەکەوێ کە کوردستان بەشـێکی بـەرچاوی لەتواناکانی گەڕاوەتەوەو چریکەکانی نـوێ بووتـەوە، لـەکاتێکدا کوردسـتان خـۆی وڵاتی ڕەنگ و پایتەختی ڕەنگەکانەو دەتـوانم بڵێـم جوانـترین چەپکـەکانی ڕەنـگ لەسەر گۆی زەوی لەودا دەبینرێن کە ئەم بەرهەمە توانیوێتی هەستی ڕەنگی لەلای خوێنەر ڕا چەینی و بایەخی ئەم جیهانی ڕەنگەی پێ بناسێنێ.

بۆئەوەی ئێوەی بەڕێز ئاگـاداری و پێشـبینی گرنگـی نـاوەڕۆکی ئـەم کۆششـە زانستییە گرنگ و گەورەیە بکەن، پێم باشە ئـەوەبزانن کـە کتێبەکـە لـە خۆیـدا، یەکەمین بەشداریی کوردییـە لـە ڕوونکردنـەوەی بـیردۆزی ڕەنـگ و چەمکـەکانی لەڕێگای کەناڵی گەیاندنی زمانەوە. دانەر باسی بیردۆزی ڕەنـگ لـەڕووی زانسـتی فیزیك و زمانەوە دەخاتەڕوو وشە ڕەنگییەکان دەستنیشان دەکات، هەروەها واتـا گشتییەکانی ڕەنگ لەلای هەندێ نەتەوە و لەبواری جیاجیادا دەخاتە ڕوو کە خـۆی لەخۆیا دیاردەیـەکی گەردوونییـەو ڕۆڵـی جیاجیـا لـەبواری جیاجیاشـدا دەبینـن. ئاوڕدانەوە لە ئەرك و گرنگیی وشەڕەنگییەکان لـەڕووی فراوانکردنـی فەرهـەنگ و بەرزکردنەوەی ژمارەی وشـەی کـوردی، ئـەرکێکی سـەرکەوتووانەی ئـەم کۆششـە زانستییەیە، لەکاتێکدا هەموو مرۆڤێکی سـەرگۆی ئـەم زەوییـە ڕۆژانـە مامەڵـە لەگەڵ ئەم دانە زمانییانەدا دەکات بەبێ ئەوەی سەرنجی تەواویان بداتێ و بیری بـۆ ئاسۆیی دەورو بەری بڕوات.

خسـتنەڕووی بـیردۆزی فـیزیکی ڕەنـگ و گرێدانـی بـەربیردۆزەکانی زمانـەوە توانیۆیتی تام و چێژو بەهایەکی تر بداتە کارەکە، کەواتە بەستنەوەی دروسـتبوونی وشـە ڕەنگییـەکان بەپێویسـتی مرۆڤـەوە بـۆ پێکهاتەیـەکی نـوێ، ئەمـە دەستنیشانکردنی خودی پێشکەوتنی زمانە.

هـەروەها باسـکردن لـە هەرەمـەکیی دروسـتبوونی وشـەش، گەڕانەوەیـە بـۆ بیردۆزەکەو، ڕێزگرتنە لەکاری زانستیی نەتەوەکانی دیکەو خۆبەستنەوەی ڕیزبوونی وشەکانی ڕەنگ بەجۆری ڕیزبوونی ڕەنگـەکانی پەلکەزێڕینـەوە، خـۆی لـە خۆیـدا گرێدانی زمانی کوردییە بەبنەما سـەرەکییەکانی زمـان و، سـەلماندنی دەسـەڵاتی زمانەکەشمان بۆ مەبەسـتەگەورەکانی لـە یـەکچوون و ڕەتکردنـەوەی ئـەو بیرۆکـە نەزۆکانەی کە زمانی کوردی لە جیهانییەت و بنەماکانی جیهانییـەتی زمـان کـە ناوە ناوە لێرەولەوێ ئەزیقێنن.

لەبواری وشەسازیشدا ئاماژە بەهەندێ پێشگرو پاشگرو مۆرفیمی بـەند کـراون کەبۆ مەبەستی مۆرفۆلۆجی لەگەڵ وشەکانی ڕەنگـدا کـار دەکـەن و دەبنـە هـۆی گۆڕینی حاڵەت و جۆرو پۆلکردن.

ئاوڕدانەوە لە ئاستی واتاسازی لە کێڵگەی ڕەنگدا، ئـەرکێکی گرانـە ئەمـەش لەبەر ئەوەیە کە واتا سرکەو ناگیرێ. کەچی لەم بەرهەمە زانستییەدا واتای گشـتی و، تایبەتی (لەهەندێ ئیدیەمدا) خراونەتە ڕووکە دەچنە ناو بواری سـیمانتیکەوە. لـە کـاتێکدا لـە کێڵگـە واتاییـەکانی هێمایـان سـیمۆلۆجی و گەڕانـەوە هـەند تێکچرژاون کەلە زمانە ئەوروپایەکانیشدا مـرۆڤ تووشـی سەرسـوورمان دەکـەن، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تەمومژ لەسەر هەندێکیان هەیەو هەندێکیشیان ئا دگارەکانیان ئاشکرانین.

بەم ڕاستییەش گرنگی و قەبارەی کۆششی دانەرمان لەلا ڕوونتر دەبێ و بایەخ و واتای نامەکەش ئاشکراتر. لەکاتێکدا ئەوە دەزانـین کـە زمـانی کـوردی لـەڕووی لێکۆڵینـەوەی زانسـتییەوە لـەچاو ئـەو زمانانـەدا جیاوازییـەکی زۆری هەیـــە و تۆژینەوەی زۆر بۆکوردییەکە نـەبوونی، کەواتـە گرفتـی سـەرچاوە بـۆ ئـەم جـۆرە بەرهەمانە گرفتێکی گەورەیە و دانەر تووشی پشت بەستن بە خودی نموونەکان دەبێ و ئەمەش کێشەی نوێ دەخاتە سەر لایەنە تێکچرژاوەکانی واتا.

پاشکۆی ئـەم کۆششـە ئـەو فەرهەنگۆکـە قەشـنگەیە کـە ڕۆڵـی لێکسـیکی وشەڕەنگییەکان دەستنیشان دەکات و پانتایی هـەر ڕەنگێـك ڕوون دەکاتـەوە لـەو بەشـداربوونە زینـدووەدا کـە هـەنگاوێکی نوێیـە بـۆ بەفەرهـەنگکردنی وشـەی کێڵگەیەکی سیمانتیکی سەربەخۆ.

لـە کۆتـاییدا دڵنیـام کـە ئـەم کتێبـە نوێیـە. وەکـو بـواری تۆژینەوەکـەی بەشدارییەکی بـاش لـە تـێڕوانینی ڕەخنـەگر و خوینـەرو بـەدواداچوانی هونـەری شێوەکاری و دیکۆرستەکاندا دەبێ، بەمەش بابەتی ئەم بەرهەمە دەتوانـێ بچێتـە ناو لایەنی کردارییەوە و تەنها وەکو بیردۆز لەسەر ڕەفتـەکان نەمێنێتـەوە. بـەڕای من ئەم بەشداربوونە بەگەشترین خاڵی بەرچاوی کتێبەکە لەقەڵەم ئەدرێ پێـم وایـە

وەزارەتـی پـەروەردە بـەکاری بـەچاپ گـەیاندنی «رەنـگ لـە زمـانی کوردیـــدا» هەنگاوێکی پەروەردەیی کەی خستە سەر ڕێزبوونی هـەنگاوە پیرۆزەکـانی خـۆی و ئاوڕدانەوەیـەکی باشیشـە بـۆ قوتابییـانی هونـەرە جوانـــەکان و مامۆسـتاکانی پەروەردەی هونەری. لەگەڵ ڕێزمـــدا و هیـوای سـەرکەوتن بـۆ هـەمووان دەخـوازم لەکاتێکدا ئەم کۆششە بەهەنگاوی یەکەم دادەنرێ و نـاکرێ چـاوی هەڵسـەنگاندن نەڵێ کارێکی فرە باشە.

**د. ئیسماعیل محەمەد فەهمی قەرەداغی**

**پرۆفیسۆری یاریدەدەر ـ ئەدەبی ئینگلیزی**

**بەشی ئینگلیزی ـ کۆلێژی ئاداب ـ زانکۆی سەلاحەددین**

٢٠٠٢/٧/٢٢

# پێشەکی

**ناونیشانی نامەکە:**

لێکۆڵینەوەکە لە ژێر ناونیشانی (ڕەنگ لە زمانی کوردیـدا- لێکۆڵینەوەیـەکی لێکسیکی-سیمانتیك)ی دایـــە. ئەمـەش چـوار چێوەیـەکی تیـوری بـۆ سـەرجەم لێکۆڵینەوەکە دادەڕێژێ ، کە بریتییە لە شەن و کەو کردنی وشـەکانی ڕەنـگ لـە چوارچێوەی فەرهەنگسازی و واتاسازیدا.

**سنووری باسەکە:-**

مەبەسـتی سـەرەکی لـــە دیـــاریکردن و جیاکردنـــەوەی ئاســـتەکانی زمـــان ئاسانکردنی کاری لێکۆڵەرە، بۆ ئەوەی زاڵـتر بـێ بەسـەر کەرەسـتە خاوەکـاندا و لێکۆڵینەوەکە لە پەرت و بلاوی بپارێزی و چڕی بکاتەوە هـەر بـەم مەبەسـتەش ، نامەکە لە چوارچێوەی ئاستی واتاسازی ناچێتە دەرەوە و سروشتی نامەکەش ئەمە دەسەپێنێ کە سەرتاسەری لێکۆڵینەوەکە لە چوارچێوەی ئاستی واتاسـازیدا بێـت، چونکە وشە ڕەنگییەکان سروشتێکی ڕێزمانییان نییە تاوەکو بچنە ناو ئاســتەکانی ترەوە . بۆ نموونە لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا هیچ دیاردەیـــەکی مۆرفۆلۆجـی نـاتوانێ دەستنیشانی وشەکانی ڕەنگ بکات ، وەکو بەشێك لـە بەشـەکانی ئاخـاوتن. لـە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا نەك هەر نابنە بەشێکی سەربەخۆی ئاخاوتن بەڵکو تەنانـەت هیچ دیاردەیەکی مۆرفۆلۆجیش نـاتوانێ وشـەکانی ڕەنـگ دەستنیشـان بکـات و

لەبەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناوی جیابکاتەوە، چونکە وشەکانی ڕەنگ لەگەڵ هەموو ئاوەڵناوەکانی تری زمانی کوردیدا دەچنە ناو بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناوەوە، هەر بۆیەش لێکۆڵینەوەکەمان پەیوەندیی بە ئاستی مۆرفۆلۆجییەوە نییە تەنها لە هەندێ باردا نەبێت کە ناچاربووین ئەم دەرگایە بکەینەوە و وەك بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناوی، ڕۆڵی وشەکانی ڕەنگ بەرچاو بخەین. لە ڕووی ڕیزبوونی ووشەکانی ڕەنگ لەگەڵ هەندێ چاوگدا و دروستکردنی ووشەی نوێ و چۆنێتی چوونە پاڵ یەکی لەگەڵ مۆرفیمە بەندە ڕێزمانییەکاندا ئەوەی لە ئاستی وشە سازدا پەیوەندیی بە ووشەکانەوە هەیە لایەنی واتاکایەتی کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا گرنگی تەواوی پێ دراوە و وەکو دانەیەکی فەرهەنگی (لێکسکی) لێمان کۆڵیوەتەوە.

لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا لە دوو گۆشەنیگاوە سەیری وشە دەکرێ کە بریتییە لە (فۆرم-لێکسیم) لایەنی لێکسیمی تەوەرەی سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێمەیە هەروەکو لە ناونیشانەکەشیدا ئاماژەی پێکراوە، هەروەها ئەو ئیدیەمانەشی گرتۆتەخۆ کە وشەکانی ڕەنگ بەشدارییان لە پێکهاتەکانیدا کردووە.

ئاستی ڕستەسازیش ناتوانێ هیچ سیمایەکی تایبەتی بۆ وشەکانی ڕەنگ دەستنیشان بکات، بۆیە وەکو هەموو ئاوەڵناوێکی کەی زمانی کوردی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات لەبەر ئەمەشە لێکۆڵینەوەکەمان پەیوەندیی بە ئاستی سینتاکسەوە نییە،،بەمەش لێکۆڵینەوەکە، تەنیا لە چوارچێوە ی ئاستی واتاسازیدایە جا چ وەکو لێکسیم، یان ئیدیەم،یان واتا گشتییەکانی ڕەنگ.

**کەرەسەی لێکۆڵینەوەکە:-**

بەپلەی یەکەم کەرەستەی ئەم لێکۆڵینەوەیە، ئەو وشە ڕەنگییانەیەکەلە فەرهەنگە کوردییەکاندا هەن و ڕاڤەکراون، جگە لەوەش ڕاپرسی ئازاد بەکارهێنراوە بۆ ژماردن و دەستنیشانکردنی وشەکانی ڕەنگ و واتاکانیان لەلای(٢٠٠) قوتابی زانکۆی سەلاحەددین. سەرەڕای ئەمانەش هەندێ لە ئیدیەمەکان لە دەمی خەڵکی کوردەوە وەرگیراون و سوود لە دیوانی چاپکراوی هەندێ شاعیرە کوردەکان وەرگیراوە و هەندێ نموونەش لە چیرۆکە کوردییە

بلاۆکراوەکـان بـەکارهێنراون، هـەروەها تـا ڕادەیـەك سـوودم لـە زانیـاریی خـۆم وەرگرتووە وەکو مافێکی ئاسایی لێکۆڵەر.

شـایانی ئامـاژە پێکردنـە تیشـکی لێکۆڵینەوەکـەمان ئاراسـتەی ئـەو وشـە ڕەنگییلنە کردووە کە لە زمانی ستانداردا بەکاردێن، تەنانەت ئیدیەمەکانیش هـەر لە چوارچێوەی ئەو زمانە دان. ناوبەناویش سنووری زمانی ستاندەردمان بـەزاندووە بەرەو دیالێکت و گۆڤەرە جیاجیاکانی زمانی کـوردی ڕۆیشـتووین وەك: کرمـانجی ژووروو، گۆران،گەرمیان، لە ڕووی جوگرافیاشەوە سنووری ئەنجامدانی ئامارەکان و سەر ژمێرکردنی ناوی گوند و ناوچەکان کە ڕەنگ بەشداری لە داڕشتنیاندا دەکـات تەنیا کوردستانی باشووری گرتۆتەوە.

**گیروگرفتەکان:-**

دیارە هەموو کارێکی زانستی کەم یان زۆر گیروگرفت دێتە ڕێگای، گـەورەترین کۆسپیش لە بەردەم لێکۆڵینەوەی زمانەوانیدا نەبوونی سـەرچاوەیە، قـەبارەی ئـەم کۆسپانەش تەنیا لێکۆڵەر ڕووبەڕووی دەبێتەوە و دەزانێ چەندە، ئەمەش گرفتێکی سەرەکییە کە هاتــەپێش ئـەم کۆششـە. سـەرەڕای ئەمـەش، کـەمی هاوکـاری و بەدەنگەوە نەهاتنی شێوەکارانی کورد کـە ڕاپرسـیان خرایـە بەردەسـت و زۆربـەی زۆریان پڕیان نەکردەوە و کەمتەرخەمییان لە تۆمارکردنی زانسـتیە داواکراوەکـاندا کرد، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کارەکەمان دوا بکەوێ.

**ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە:-**

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە چوارچێوەی ڕێبازی وەسـفیدا ئـەنجامدراوە و ویسـتوومانە بەشێوەیەك باسی ڕەنگ بکەین کە چۆن ئێستا لە ناو زمانی کوردیدا بەکار دەبـرێ و هەڵس و کەوت دەکات، بەبێ ئەوەی بچینە ناو لایەنی مێژوویی ووشەکانەوە ئەو ئامار و ڕاپرسانەش کە کـراون بـۆ پتـەوکردنی بنـەماکانی ڕێبازەکـە و گەیشـتنە ئامانجەکانی هاتوون. جگە لەوەش لەبەشی واتاکانی ڕەنگدا نموونە بۆ واتای گشتی ڕەنگەکان لەلای هەندێ نەتەوەکان هێنراوەتەوە،بـەلاّم تیشـك خراوەتـە سـەر ئـەو واتایانەی کە کورد پێی بەخشیون.

**گرنگی و ئامانجی باسەکە:**

گرنگیی باسەکە لەوەدایە کە تاوەکو ئێستا ئاوڕ لەڕەنگ و وشەڕەنگییەکان نەدراوەتەوە، گەرچی خۆی لە خۆیدا کێڵگەیەکی واتاییە و لەناوخۆشیدا دەبێتەوە بە چەندین کێڵگەی ترەوە. هەروەها وشەکانی ڕەنگ پانتاییەکی باشی لە بواری لێکسیکیدا پڕ دەکاتەوە و ژمارەیەکی فراوان لە ووشەکانی کوردیدا پێکدەهێنێ، سەرەڕای بەشداریکردنیان لە ژمارەیەکی زۆری ئیدەیەمەکانی زمانی کوردیدا.

لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا تۆژینەوە لەسەر ڕەنگ ئەنجام دراوە، بە تایبەتی لەسەرەتای حەفتاکانەوە دوابەدوای لێکۆڵینەوە بەناوبانگەکەی (بێرلن وکەی). کوردیش وەکو زمانێکی زیندووی ئەم سەردەمە، لەم جۆرە کۆششانە بێبەش بووە،بۆیە بەسەرکردنەوەی بابەتی ڕەنگ لە زمـاندا گرنگییەکی تایبەتیی خۆی هەیە و شوێنی زمانی کوردی لەسەر بنەماکانی تۆژینەوەکەی بێرلن و کەی لە پۆلکردنی زمانەکانی جیهاندا دیاری دەکات. ئەمەش ئامانجێکی سەرەکی ئێمەیە سەرباری ئەمەش گرنگی ڕەنگ دەردەخات سەبارەت بەپۆلکردنی دەور و بەر و دەستنیشانکردنی وشەلێکسمییەکان و دانانی فەرهەنگێکی تایبەت بەوشە ڕەنگییەکان.

نامەکەش لە سێ بەشدا خۆی دەنوێنێ جگە لە پێشەکی و پاشکۆ و ئەو ئەنجامانەی کە پێی گەیشتووە، ناوەرۆکەکەش بەم شێوەیە.

## بەشی یەکەم

ئەم بەشە بۆ خستنەڕووی بیردۆزەکانی ڕەنگ تەرخان کراوە، ئەم بیردۆزانەش. لەبواری زانستیی فزیکیدا دۆزراونەتەوە، درێژی شەپۆلی ڕەنگەکان بەپێی بۆ چوونی زاناکانی فیزیك خراونەتەڕوو.دەسنیشانکردنی یەکەی پێوانیش بەئەنگسترۆم جێگیرکراوە، کە هەموو ڕەنگە بینراوەکان لەنێوان درێژیی شەپۆلی ۷۲۰۰-۳۸۰۰ ئەنگسترۆمدا دەبن و لەسەرەوەو خوارەوەی ئەو دوودرێژیی شەپۆلانەدا . ژمارەیەکی زۆری ڕەنگ هەن، بەلاَم بەچاو نابینرێن. هەروەها لەم

بەشەدا پەیوەندیی نێوان تیشك و ڕەنگ ڕوونکراوتەوە و ژمارەی ڕەنگەکانی شەبەنگ دەسنیشان کراون . جگە لەوەش بەتێر و تەسەلی باس لە میکانزمی ڕەنگ بینین کراوە، ڕۆڵی چاو و چۆنێتی و ناوەندە بەرپرسەکانی ڕەنگ بینین دەسنیشان کراون.هەروەها باس لەنابینایی ڕەنگ و جۆری پلەکانی کراون و هۆکارە بۆماوەیەکان و دەرەکییەکانی ئەم نەخۆشییە دیاری کراون و بەنەخشەی زانستی بەرچاو خراون. لەم بەشەشدا بیردۆزەکانی پۆلکردنی ووشەکانی ڕەنگ لەزماندا خراونەتە ڕوو، بەپێی ئەو بیردۆزانەش ووشەکانی ڕەنگ لەزمانی کوردیدا ڕیزکراون، ئەو بیردۆزانەش، لەسێ جۆردا خۆیان دەبیننەوە کە بەپێی/هەرەمەکی/ ئەرك و پێوستی/شەبەنگ/ ڕیزدەبن.

## بەشی دووەم

ئەم بەشە لەوشەکانی ڕەنگ دەدوێ،بۆ ئەم ڕیزبوونەش، ڕاپرسی (٢٠٠) قوتابی زانکۆ کراوە، هەروەها وشەکانی ڕەنگ لەڕووی مۆرفۆلۆجییەوە دابەشکراوە، بەنموونە ڕوون کراونەتەوە، ووشەکانی ڕەنگ لەژێر وشەی (ڕەنگ)دا کۆدەبنەوەو لەنێوان خۆشیاندا بەسەرگرووپی جیا جیا دا دابەش دەبن، بەگوێرەی ڕیزبوون ئەو ئاوەڵناوانە دەسنیشانکراون، کەدەدرێنە پاڵ وشەکانی ڕەنگ. هەروەها ڕۆڵی وشەکانی ڕەنگ سەبارەت بەبەشداربوونیان لەپێکهاتەی ناوی/مرۆڤ/ چیا /ڕووبار/ شوێن و گوند/ دا دیاری کراوە، لەم ڕووەشەوە، نموونە بۆ هەموویان هێنراوەتەوەو سەرژمێری ناوی دێکانی / هەولێر / سلێمانی / موسڵ /کەرکووك/ باقوبە /، کراون و ژمارەی ئەوانەی کە وشەکانی ڕەنگ بەشداریان لە پێکهاتەکانیاندا کردووە، خراونەتە ڕوو. لەم بەشەدا ژمارەیەکی باش لەو ئیدیەمانە خراونەتە ڕوو، کە ووشەکانی ڕەنگ بەشدارییان، لە پێکهاتەکانیادا کردووە، هەروەها پەیوەندیی نێوان ڕەنگ و فرمانیش لەچەند نەخشەیەکدا ڕوونکراوەتەوە، جگە لەوانەش. فەرهەنگی ئەو وشانەش کە وشەکانی ڕەنگ بەشداری لە پێکهاتەکانیاندا کردووە. لەسەر بنچینەی ڕیزبوونی تیپەکانی کوردی. خراونەتە ڕوو.

## بەشی سێیەم

ئەم بەشە تایبەتــە، بــەواتاکانی ڕەنــگ، ڕەنــگ وەکــو بوارێکــی واتــایی ڕوون کراوەتەوە وپێناسەی بواری واتایشی بــۆ کــراوە، لــەم بەشــەدا هــەموو گۆڕانێکــی واتایی ڕەنگ بەمیتافۆر دانــراوە، بەوپێیــەش مامەڵــە لەگــەڵ گۆڕینــی واتاکــاندا کراوە، بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بــۆ هۆکــاری گۆڕانــەکان، هــەروەها بــاس لــەواتای گشتیی ڕەنگەکان کراوە/ سوور/ زەرد/ سەوز/ شین/ ڕەش /سپی/مۆر/خۆڵەمێشی و قــاوەیی / لــەم ڕووەوە ئامــاژە بەئــەو واتایانــەکراوە کــە کــورد تیشــکی خستۆتەسەریان.پاشان باســی واتــای بەشــێك لــەو ئیدیەمانــە کــراوە کــە ڕەنــگ بەشداریی لە پێکهاتەکانیاندا کردووە و نموونە بۆ واتای ئیدیەمەکان هێنراونەتــەوە بەبێ ئەوەی بگەڕێینەوە سەر پۆلکردنی واتای کۆمەڵایەتی یــان دەروونــی. بــەڵکو واتاکان چۆن بەکاردێن بەو شێوەیە ڕوون کراونەتەوە، ناو بەناویش ئەگەر گۆڕان لــە بواری واتاییدا هەبووبێ ئەوا ئاماژەی پێکراوە، لەم بەشەدا چەندین هێڵکــاری بــۆ ڕوونکردنەوەی واتای ئیدیەمەکان خراونەتــە ڕوو، بــۆ ئــەوەی واتــای ســەرەوە کــە بەواتای فەرهەنگی لەقەڵەم ئەدرێ،لە واتای ژێرەوە جیا بکرێتــەوە کەئیدیەمەکــە دەگرێتەوە و دوور کەوتنەوەی تیا بەدی دەکرێ.

# پەیوەندیی نێوان ڕەنگ و تیشك

کاتێك کە تیشکی ڕووناکی بەڕاستەڕێی خۆیدا دەڕوات، بەر ئەو تەنانە دەکەوێت کە دێنە پێشی، هەر تەنێکیش خاوەنی کۆمەڵێ تایبەتمەندیی خۆیەتی، یەکێك لەو تایبەتمەندییانەش، ڕادەی (هەڵمژینی یان هەڵگەڕانەوەی ئەو درێژیی شەپۆلە کەهرۆموغناتیسییانەیە، کە لەناو تیشکدا هەن و بەریان دەکەوێ)١.
بەپێی ئەم ڕاستییە: ڕەنگ دەبێتە ئەو پێوەرە زانستییەی، کە دەسنیشانی ڕێژەی هەڵمژین، یان هەڵگەڕانەوەی تیشکی کەهرۆموغناتیسی دەکات، دیارە لە هەردوو بارەکەشدا ئەگەر چاوی مرۆڤ ئەو تیشکە هەڵگەڕاوانەی وەرگرت و ، لێکیانی دایەوە، ئەوا ڕەنگ دەبێتە سیمای جیا کردنەوەی تەنەکان و لەڕێگای ئەو کردارەشەوە سەرناس دەکرێن و دەبینرێن.
بۆ یەکەمجار، لە بواری زانستیی فیزیکدا زانای ئینگلیزی (نیوتن) توانی لە ساڵی ١٦١٢ زاینی دا تیشکی ئاسایی خۆر بەڕێگای (ئاوێزە موشور) ەوە شی بکاتەوە و ڕەنگەکانی شەبەنگ دیاری بکات، ڕەنگەکانیش بریتین لەمانە:-
سوور[٢]

---

[1]/Norman J.juster 1962 color and chemidal constitution, 39 (1) . p 596- 601

[2]/ Shortly and williams,1965, Elem entys of physics, prrinctice Huy . p 115

پرتەقاڵی
زەرد
سەوز
سەوزی شینباو
شین
مۆر

بۆ دەسنیشانکردنی ئەم ڕەنگانە دەکرێ بەم شێوەیە ڕوونبکرێتەوە:
ڕەنگەکانی شەپەنگ



تیشکی خۆر

دیارە ئەو حەوت ڕەنگانەی لە شەبەنگدا دەبینرێن و چاوی مرۆڤ دەتوانـێ بـە ئاسانی لەیەك جیایان بکاتەوە ئـەوا لـە ڕووی فیزیکییـەوە، هەریەکـەیان درێـژی شەپۆلی خۆی هەیە،کە دەبێتە هۆی جیاوازی ڕەنگێك لەگەڵ ڕەنگێکی کە.

بۆ ئەوەی بزانین تیشکی سپی چییە؟ ئەوا پێوسـتە بزانـرێ چـۆن ئـەو تیشـکە سپییە بەرهەم دەهێنرێ. بۆ نموونە ئەگەر ڕەنگـی ( زەرد و شـین )[٣] بەرێژەیـەکی تایبەت تێکەڵ بکرێن ئەوا ڕەنگی سپی دێتە بەرهەم وەکـو لـەم وێنەیـەدا بـەدەر دەکەوێ:-

(٣) / سەرچاوەی پێشوو. لا ١١٥




کەچی ئەگەر ڕەنگی زرد یان شین لە تیشکی سپی دەر بهێنین ئەوا ڕەنگەکەی دی دەرناکەوێ و نایەتە بەرهەم.

ئەمەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ، کە کرداری هەڵمژین و کرداری هەڵگەڕانەوەی تیشك، دووکرداری جیاوازن.

بەپێی بیردۆزی نیوتن تیشکی سپی بۆیە سپییە،ڕێژەی ڕەنگەکانی شەبەنگی وەکو خۆی تێدایە، تەنی سپیش بۆیە سپییە، ڕووی دەرەوەی تەنەکە هەموو شەپۆلە کەهرومۆغناتیسەکان بەیەك ئەندازە هەڵدەگێڕێتەو، خۆ ئەگەر تەنێکیش تێکڕای شەپۆلە کەهرۆموغنانیسییەکان ناو تیشك هەڵمژێت (نەك هەڵیگێڕێتەوە)، ئەوا ڕەنگی ئەو تەنە ڕەش دەردەکەوێت.

ئەبێ ئەوە بزانین کە جیاوازیێکی سەرەکی لە نێوان ڕەنگی سپیو ڕەنگی بۆیەی سپیدا هەیە،ئەویش ئەوەیە کە تیشکی سپی گورزەیەك شەپۆلی تێدایە کە هەر یەکەیان ڕێژایی شەپۆلی خۆی هەیە، کەچی بۆیاغی سپی یەك درێژی شەپۆلە. جا بۆ ئەوەی درێژیی شەپۆلی کەهرۆموغناتیسی هەریەکێك لەو ڕەنگانە دستنیشان بکەین کە لەناو تیشکەدا هەن، باشتر وایە سەیری ئەم خشتە خانەیە بکەین:-

| ژ | ڕەنگ | مەودای درێژیی شەپۆلەکان بە ئەنگستروٚم [٤] | |
|---|---|---|---|
| ١ | سوور | ٦٥٠٠ | ٧٢٠٠ |
| ٢ | پرتەقاڵی | ٥٩٠٠ | ٦٥٠٠ |
| ٣ | زەرد | ٥٥٥٠ | ٥٩٠٠ |
| ٤ | سەوز | ٤٩٥٠ | ٥٥٥٠ |
| ٥ | سەوزی شین باو (ئاوی) | ٤٧٥٠ | ٤٩٥٠ |
| ٦ | شین | ٤٤٥٠ | ٤٧٥٠ |
| ٧ | مۆر | ٤٠٠٠ | ٤٤٥٠ |

دەسنیشانکردنی مەودای شەپۆلەکان لە نێوان دوو ژمارەی ئەنگسترۆمدا ئەوەیە، کە یەکەمیان دەستپێکردنی شەپۆلی ئەو ڕەنگەیە و دووەمیشیان کۆتای هاتنی شەپۆلی ئەو ڕەنگەیەو دەسپێکردنی شەپۆلی ڕەنگێکی‌کەیە، کە بەدوای دا دێ وریز دەبێ و نەگۆڕە. بۆ نموونە مەودای درێژیی شەپۆلی ڕەنگی زەرد بەئەنگسترۆم لەنێوان ئەم دوو ژمارەی درێژییەدایە(٥٩٠٠-٥٥٥٠)، کە واتە ئەگەر درێژیی پێوەربێ، ئەوا ڕەنگی زەرد لەدرێژیی شەپۆلی (٥٩٠٠)ئەنگسترۆمەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە درێژیی شەپۆلی (٥٥٥٠) ئەنگسترۆم ولێرە کۆتایی دێ و ڕەنگێکی کە دەسپێدەکات، لەنێوان (٥٩٠٠-٥٥٥٠) ئەنگسترۆمیشدا هەموو پلەو تۆنەکانی ڕەنگی زەرد هەن و هەموو شیان زەردن، بەڵام هەتا دێ کاڵ دەبێتەوە تا ڕێگا خۆشدەکات بۆ ئوەی ڕەنگێکی کە دەس پێبکات، کواتە ئەگەر لە (٥٩٠٠) ئەنگسترۆم بەرز بوونەوە نزمترین

(٤) سەرچاوەی پێشوو لا ١١٧

سنووری ڕەنگێك دەسپێدەکات کە شەپۆلەکەی لەزەرد بەرزترە ئەویش ڕەنگی (پرتقاڵیە)، بەلاّم ئەگەر لە (٥٥٥٠) ئەنگسترۆم هاتینە خوارەوە ئەوا بەرزترین سنووری ڕەنگێکی کە دەس پێدەکات کە لەدوای ڕەنگی زەردەوە دێ ئەویش ڕەنگی (سەوز)ـە کەلە نێوان(٥٥٥٠-٤٩٥٠) ئەنگسترۆمدا دەبینرێت.

بەپێی ئەم مەودای شەپۆلانە، دەبێ لە نێوان شەپۆلەکانی هەر ڕەنگێکدا خالێك هەبێ، کە بە بیلبیلەی ئەو ڕەنگە دابنرێ وهەموو سیفەتەکانی ئەو ڕەنگە لە خۆ دەگرێ کە بە سێ تایبەتمەندی ناو دەبنرێن و لە لوتکەشدا دەبن کە ئەمانەن:-

(چریسکە- بەها تێری)[٥]. ئەم سێ تایبەتمەندییە لە زمانە جیا جیا کاندا بەم شێوەیە ناویان لێ نراوە:-

| ژ | ناوەکان بەکوردی | ناوەکان بەعەرەبی | ناوەکان بەفەرنسی | ناوەکان بە E | هێماکان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | چریسکە | الکنه | Teinte | Hue | H |
| ٢ | بەها | القیمه | Valeus | Value | V |
| ٣ | تێری | التشبع | sayuration | Chroma | C |

ئەگەر تەماشای ئەم سێ سیفەتانەی ڕەنگ بکەین. دەبینین دەبنە مایەی سەرەکی بۆ دەسنیشانکردنی پلەکانی ڕەنگەکان. هەرکاتێکیش ئەم سێ تایبەتمەندییە لە بەرزترین حالّەتدا بوون، ئەوا ئەو ڕەنگە لە خالّی بیلبیلەی ڕەنگەکەدا دەبێ، هەروەها وردە وردە لەگەلّ کەمبوونی مەودای شەپۆلّەکاندا، کە بەرەو ڕەنگەکانی گواستنەوەی دەڕوات، گۆڕان بەسەر ئەو سێ تایبەتمەندییە شدادێ.

(٥) / د. یحیی حمودة ١٩٨١ نظریة اللوان لا ٣٥

لە فیزیکدا یەکەی پێوانە کردنی شەپۆلەکانی ڕەنگ بە (ئەنگستڕۆم) دەسنیشان دەکرێ). ئەنگستڕۆمیش بەم شێوەیەیە.

$$\frac{\text{١ ملم}}{\text{١٠٠٠}} = \text{١ میکرۆن}$$ [٦]

$$\frac{\text{١ میکرۆن}}{\text{١٠٠٠}} = \text{١ ملیمکرۆن}$$

$$\frac{\text{١ ملیمکرۆن}}{\text{١٠}} = \text{١ ئەنگستڕۆم}$$ ئەمەش یەکەی پێوانەی شەپۆلەکانی ڕەنگە (٠)

بەمەش دەتوانین بڵێین چاوی ئاسایی مرۆڤ دەتوانێ بە تەماشاکردنێك ئەو ڕەنگە جۆراو جۆرانە ببینێ و لێکیان جیا بکاتەوە، کە دەکەنە نێوان مەودای شەپۆلی ٤٠٠٠-٧٢٠٠ ئەنگستڕۆمەوە، مەبەست لە ٤٠٠٠ ـەکە شەپۆلی ڕەنگی مۆرەو ٧٢٠٠ ئەنگستڕۆمەکەش ڕەنگی سوورە. هەر لەبەر ئەم مەودای شەپۆلانەشە کە ڕەنگی مۆر بە نزمترین شەپۆل و ڕەنگی سووریش بە بەرزترین شەپۆل دادەنرێت، هەموو ڕەنگەکانی کەش کە مرۆڤ دەتوانێ بیانبینێ، لەنێوان ئەو دوو شەپۆلەدان. هەر شەپۆلێکیش لە سەرەوەی مەودای سووری (٧٢٠٠) ئەنگستڕۆم بێت، یلن لە خوارەوەی مەودای شەپۆلی مۆری (٤٠٠٠) ئەنگستڕۆم بێت، ئەوا چاوی مرۆڤ وەریان ناگرێ و لە مێشکدا لێك نادرێنەوە، بەو شەپۆلانەش دەگوترێ: شەپۆلە نەبینراوەکان.

---

(٦) / سەرچاوەی پێشوو لا ١٠

جگە لە دەسنیشانکردنەکەی نیوتن سەبارەت بە مەودای شەپۆلەکانی ڕەنگ کە لە شەبەنگدا هەن، چەندین زانای ڕەنگ هەوڵی ئەوەیان داوە کە بەتاقیکردنەوە، ئەو سنوورانە دەسنیشان بکەن کە سنوورەکانی ڕەنگ دەگرنە خۆیان، کە دەکرێ ئەنجامی بیردۆزەکانیان لەم خشتەیەدا دیاری بکرێن:(٧)

| ناوی ڕەنگ | سنووری شەپۆلەکانی ڕەنگ لەلای زانایان بە ( ئەنگستروٚم) | | | |
|---|---|---|---|---|
| | Abney | Listing | Rood | Fleury |
| سوور | سەرەتای شەبەنگ تاوەکوو ٦٢٠٠ | ٦٤٧٠-٧٢٠٠ | ٧٠٠٠ | ٦٥٠٠-٧٥٠٠ |
| پرتەقاڵی سوورباو | / | / | ٢٩٠٨ | ٦١٥٠ |
| پرتەقاڵی | ٥٩٢٠-٦٢٠٠ | ٥٨٥٠-٦٤٧٠ | ٥٩٧٢ | ٦٠٥٠ |
| زەردی مەیلەو پرتەقاڵی | / | / | ٥٨٧٩ | ٥٩٥٠ |
| زەرد | ٥٧٨٠-٥٩٢٠ | ٥٧٥٠-٥٨٥٠ | ٥٨٠٨ | ٥٨٠٠ |
| سەوز | ٥١٣٠-٧٨٠٠ | ٤٩٢٠-٥٧٥٠ | ٥٢٧١ | ٥٢٠٠ |
| سەوزی شینباو | ٥٠٠٠-٥١٣٠ | / | ٥٠٨٢ | ٤٩٠٠ |
| شینی سەوزباو | / | / | ٤٩٦٠ | / |
| شین | ٤٤٦٠-٥٠٠٠ | ٤٥٥٠-٤٩٢٠ | ٤٧٣٢ | / |
| شینی ئاوی | ٤٤٦٠-٤٦٤٠ | ٤٢٤٠-٥٥٥٠ | ٤٣٨٣ | / |
| مۆر | ٤٦١٠-کۆتای شەبەنگ | ٣٩٧٠-٤٢٤٠ | ٤٠٥٩ | ٣٨٠٠-٤٠٠٠ |

(٧) سەرچاوەی پێشوو لا ١١

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو خشتە خانەیەی کە خرایە ڕوو، لەگـەڵ بیردۆزەکـەی ( نیوتن) دا بەراوردیان بکەین، ئەوا دەبینین کە بەرزترین شەپۆل هی ڕەنگی سـوورەو لە (٧٥٠٠) ئەنگستروم تێ ناپەرێو لە لایەن (Fleury) ـەوە دەسنیشـان کـراوە، نزمترین شەپۆلیش هی ڕەنگی مۆرە، کە (٣٨٠٠) ئەنگسـتروم کـەمتر نییـەو لـە لایەن هەمان زاناوە دەسنیشانکراوە.

ڕەنگەکانی شەبەنگ حەوت دانەن و بە حەوت ووشەش ناویان لێـنراوە کـەچی، ژمارەی ڕەنگ بێ کۆتاییـە و لەهـەندێ کۆمپیوتـەرەکاندا بـە (٣٥-٧٠) ملیـۆن ڕەنگ دادەنرێن.

لە هیچ زمانێکیشدا نەتوانراوە ووشە بۆ ئەو هەموو ڕەنگانە دابنرێ، لەلایـەکی کەشەوە ڕووبەری هەموو تەنێك بـەپێی زبـری و لووسـی کاردەکاتـە سـەر جـۆری ڕەنگەکان. دیارە ڕووبەری لووس پتر شەپۆڵەکانی هەڵدەگرێتەوە کە دەبێتە ڕەنگی تەنەکە، تەنی زبریش توانای هەڵگەرانەوەی شـەپۆڵەکانی ناوتیشـکی کـەمترە بـۆ نموونە ئەگەر تەنێکمان هەبێ ، نیوەی لووس بێو نیوەکەی کەشی زبربێ، تەنەکەش درێژایی شەپۆلەکانی سوور هەڵگەڕێنێتـەوە، ئـەوا نیـوەی لووسـەکە مەرجـەکانی ڕەنگی سووری زیاتر تێدا دەبێ لە وەی کە لە نێوان زبرەکەداهەیە، گەرچی ڕەنگـی هیچ تەنێکیش تەنها بەکرداری هەڵگەڕانەوەی شەپۆلەکان دەسنیشان ناکرێ، بەڵکو کرداری هەڵمژینیش هەمان گرنگیی هەیە بۆنموونە بـۆ ئـەوەی ڕەنگـی زەرد ببینـین دەبێ ئەو تەنە شەپۆلە کەهرۆموغناتیسیەکانی ڕەنگی شینی هەڵمژیبێت. یـان بـۆ ئەوەی ڕەنگی شین ببینین، ئـەوا دەبـێ تەنەکـە شـەپۆلە کەهرۆموغتاتیسـیەکانی ڕەنگی زەردی هەڵمژیبێت.

بۆ ئەوەی ڕەنگێکی دیاریکراو ببینرێ، دەبێ شەپۆلی ڕەنگی دی هـەڵبمژرێت، وەکو لەم خشتە خانەیەدا دەسنیشان کراون:- [٨]

| | ڕەنگی بینراو | شەپۆلی ڕەنگی هەڵمژراو |
|---|---|---|
| ١ | سەوزی زەرد باو | مۆر |
| ٢ | زەرد | شین |
| ٣ | پرتەقاڵی | شینی سەوزباو |
| ٤ | پەمەیی | سەوز |
| ٥ | سوور | سەوزی شین باو |
| ٦ | شین | زەرد |
| ٧ | شینی سەوز باو | پرتەقاڵی |
| ٨ | سەوزی شین باو | سوور |

## میکانیزمی ڕەنگ بینین

توانای ڕەنگ بینین لەلای مرۆڤ دەگەڕێتەوە بـۆ توانـای ئـەو (شـانە تەشـیلە پیانـەی conepingmen+s) کـە لـەتۆڕی چـاودا هـەن و ژمارەکەشـیان دەگاتـە نزیکەی (١٣٧) ملیۆن شانە. (١٣٠) ی ملیۆن شانەیان تایبەتن بـە جیاکردنـەوەو بینینی ڕەنگی ڕەش و سپی و (٧) ملیۆنەکـەی کـەش تایبـەتن بـۆ جیاکردنـەوەو بینینـی ڕەنگـەکانی کـە شـانە بـەر پرسـەکانی ڕەنگـی ڕەش و سـپی پێیـان

(٨) Jon H. Kennedy 1984, Analytical chemistry Principles. P.410 ⁄

دەگوترێ(Rods) ئەو شانانەش کە بەر پرســی ڕەنگـەکانی کـەن پێیـان دەگوتـرێ (Cone). لـەناو هەریـەکێك لـەو شـانانەدا شـیلەیەك هەیـە هەسـت بەشـەپۆلی ڕەنگەکان دەکات. کاردانەوەی ئەم شانانە لە ڕێی دەمارەکانەوە دەچن بۆ مێشـك و لەوێ بەپێی بەرپرسێتی شانەکانی مێشك جـۆری ڕەنگـەکان دەسنیشـان دەکرێـن، کەواتە ڕەنگ لەدەرەوەی مرۆڤدا بوونـی نییـە بـەڵکو لـەناو مرۆڤـدا و لـەرێگای چاوەکانییەوە ڕەنگ بوونی هەیە، توانای ڕەنگ بینینیش لـەلای هـەموو کەسـێك وکو یەك نـی یـە بەتایبـەتی سـەبارەت بـەو ڕەنگانـەی ، کـە لەیەکـەوە نزیکـن بەواتایەکی تر کە مەبەست لەورەنگانەیە کە ( تۆنەکانیان لە یەکەوە نزیکن)[٩].

سەبارەت بەناستەنگەیی جیاکردنـەوەی ڕەنگـەکان ئـەوەبوو (هیـو بـارت) بـۆ یەکەمجار توانیی ئەو ڕاستییە نەیدەتوانی گەڵای دارێکی سەوز و پارچـە مۆمێکـی سـوور لەیـەك جیـا بکاتـەوە، پـاش ئەمـەش بیردۆزەکـەی نیوتـن سـەبارەت بەدەسنیشانکردنی شەپۆلەکانی ڕەنگ لە دایك بـوو دوای سـەدەیەکیش ( تۆمـاس یونگ )[١٠] ی بسەلمێنێ پاشان (Dalton) کە زانایێکی کیمیایی ئەتۆمی بـوو لـە ساڵی ١٧٩٤ دا تووشی نەخۆشییەك بوو کە بەریتانی کە لەنێوان ساڵانی (١٧٧٣-١٨٢٩) دا ژیاوە توانیی میکانیزمی وەرگتن و جیـا کردنـەوەی ڕەنگەکانیلەسـەر تۆری چاو ڕوون بکاتەوە. بیردۆزەکەی یۆنگ بەبیردۆزی (سیانەی ڕەنگ ) ناونرا بـە و پێیەی شانە تەشیلەکانی سەر تۆری چاو بەسـەر سـێ جـۆردا دابـەش دەبـن کـە ئەمانەن: -

أ- ئەو شانە تەشیلانەی، کە بە شەپۆلە درێژەکانی تیشك دەبزوێن.

ب- ئەو شانە تەشیلانەی، کە بەشەپۆلە مام ناوەندییەکانی تیشك دەبزوێن.

جـ- ئەو شانە تەشیلانەی، کە بە شەپۆلە کورتەکانی تیشك دەبزوێن.

دەربارەی ئەم بیردۆزەیە گەڵی زانـای کـە پشـتگیرییان لیٚ کـردووە، لەوانـە:- (هیلمهۆلتز). ئەم پشتگیریکردنە بووە هۆی ئەوەی کە بیردۆزەکە بـەناوی بـیردۆزی

---

(٩) /سلام جبار الربيعي ١٩٨٨/ عمى اللوان / العراق/ منشورات الجمهورية ع(١٠)

(١٠) / أحمد مختار عمر /١٩٨٢/ اللغة واللوان / كويت / دار البحوث العلمية لا ٩١

(یونگ هیلمهۆلتز)[11] ـەوە ناوزەد بکرێت کـە تایبەتـە بـە چۆنێـەتی بینینـی ڕەنگ و جیاکردنەوەی ڕەنگەکانـە لـە لای مـرۆڤ. ئـەم هێڵکارییـەش[12] جـۆری کاردانـەوەی هەرسـێ جۆرەکـانی شـانەکان دەسنیشـان دەکـات سـەبارەت بـە شەپۆلەکانی ناو تیشك:-




أ= ئەوانەی بە شەپۆلی درێژی (سوور) دەبزوێن.

ب. ئەوانەی بە شەپۆلی مام ناوەندی (سەوز) دەبزوێن.

جـ. ئەوانەی بە شەپۆلی کورت (مۆر) دەبزوێن.

پێش سەدەیەك بیردۆزی (بەرانبەرکێ پـەیڕەو دەکـرا کـە لەلایـەن E-Hering ـەوە دانرابوو)،[13] ئەم بیردۆزەیە وای لێك دەدایەوە، کە ڕەنگ بینین لەلای مـرۆڤ بە ڕێگای سێ جمکانەی ڕەنگەوە ئەنجام دەدرێت، ئەوانەش ئەمانەن:-

---

(١١) / د. يحيى حمودة / ١٩٨١ نظرية اللون لا (٣٧)

(١٢) / سەرچاوەی پێشوو لا (٣٧)

(١٣) / احمد مختار عمر، ١٩٨٢، اللغة واللون، لا٩١-٩٢

سپی‌و ڕەش
زەردو شین
سوورو سەوز

- بۆ ئەمەش سەرجەم تۆڕی چاوی مرۆڤی بەسەر سێ ناوچەدا دابەشکردووە، کە هەر ناوچەیەکی هەستی بە ڕەنگێك کرد ئەوا هەستکردن بە ڕەنگە جمکانەی ئەو ڕەنگە بینراوە دەکرێ، بۆ نموونە لە ڕێگای هەستکردن بە سێ ڕەنگەکانی یەکەمی جمکانەکەوە کە (سپی‌و زەردو سوور)ن ئەوا لە ڕێگای ئەوانەوە هەست بە سێ ڕەنگی دووەمی جمکانەکان دەکرێن کە ئەمانەن (ڕەش شین سەوز).

جگە لەو دوو بیردۆزانە بیردۆزی سێیەمیش هەیە کە ژمارەی جمکانەکانی ڕەنگ بە چوار دانە دادەنێ‌و، لە ڕێگای هەستکردن بە هەر دانەیەك لە یەکەمی جمکانەکان ئەوا هەستکردن بە ڕەنگی دووەمی ئەو جمکانەیە دەکرێ، هەروەها بۆ ئەوە دەچن کە هەر ڕەنگێك دەماری تایبەتی خۆی هەیە لە چاوەوە دەیگوێزێتەوە بۆ مێشك و لەوێش جۆری ڕەنگەکە پۆل دەکرێ‌و جیا دەکرێتەوە.

## بیردۆزی پۆلکردنی وشەکانی ڕەنگ لە زماندا

ئەگەر تەماشای وشەکانی ڕەنگ بکەین، دیارە توانیویانە بەشێك لەو ڕەنگانـە بگەیەنن کە لە سروشتدا هەن، بە واتایەکی کە ژمارەی وشەکانی ڕەنـگ لـە هـەر زمانێکدا هەرچەندە زۆریش بن، ئەوا لە ژمارەی ئەو ڕەنگانە کەمترن کە هەن، لـە ڕووی مێژووییشەوە ئەوا شتێکی لۆجیکییــە کـە ڕەنـگ لەگـەڵ بوونـی تیشـکدا هەبووەو پاش ئەوەش وەکو هەنگاوی دووەم لەرێگای بینین و تێگەیشــتنەوە، وشـە بۆ ناوی ئەو ڕەنگانە دانراون، شتێکی دروست و ئاساییە کە تێگەیشتنی مرۆڤیـش لە کۆندا سەبارەت بە ڕەنگ وەکو ئەمڕۆ نەبووبێ‌و (گۆڕانی بە خۆیەوە بینیبێــت و بە قۆناغی جیاجیادا تێپەڕیبێت)[(١٥)].

نەك هەر ئەمە، بەڵکو ژمارەی وشەکانی ڕەنگ لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی کـە ئەگۆڕێت، بۆ نموونە لە ناوچەی ئەسکیمۆ پتر لە کۆمــەڵێ نـاو بـۆ بـەفر دانـراوە، بەشێکی زۆریان پەیوەندییان بە جۆرو ڕەنگی بەفرەکەوە هەیە، جگە لە مانەش زۆر جار (ئاستی ڕۆشنبیریش) ڕۆڵی بـەرچاوی خـۆی لـەو تێگەیشـتنەدا دەبینـێ‌و لـە ژمارەو پۆلکردنی وشەکانی ڕەنگیشدا کاردانەوەی هەیە.

بەپێی ئەو بۆچوونانە، ئەوا ئەبێ وشەکانی ڕەنگ جۆرە ڕیزبوونێك بگرنە خۆیـان کە ڕەنگدانەوەی خودی ڕەنگەکان بن. دیارە بۆ ئەمەش سێ مەرجی سەرەکی هـەن کە ڕۆڵی تەواو لەو ڕیزبوونەدا دەبینن کە ئەمانەن:-

١-چریسکە

٢-بەها

٣-تێری

---

(١٥) - احمد مختار عمر، ١٩٨٢، اللغة واللون، لا٤٩.

ئەرکی نواندنی ئەو سێ مەرجەش سپێردراوەتە ژینگەو کاریگەرییان لە ڕێگــای جۆرو ژمارەکانیانە وە دەسنیشان دەکرێن و، دەبنە هۆی سەرەکی بۆ لــەدایکبوونی ناوەکانیان و هەڵبژاردن و ڕیزبوونی وشەکانیان، مەرجیش نییە هــەموو ڕەنگــەکان وەکو یەك کاریگەرییان لەسەر مرۆڤــی دەوروبەرەکــەی هــەبێت بــەپێی ســەردەمە جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤایەتی، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کــە وشــەکانی ڕەنــگ لــە قۆناغی سەرەتاییەوە بەرەو قۆناغی گەشەسەندنی ئــەمڕۆی هــەنگاوی نــاوە، ئــەم مێــژووەش تەمــەنێکی دوورو درێــژی هەیــە، بــۆ نموونــە لــە ســەردەمی چـــاخی بەستەڵەکدا، کاتێك کە (مردوویەك مردووە، ئەوا ئێسکەکانیان بــە ڕەنگــی زەردی سوورباو بۆیە کردووە)[16].

سەبارەت بە مێژووی ڕەنگ لەناو کۆمەڵی کوردەواریدا بەڵگەی زیندوو هەن، کە کورد گەلێ پێش ئەو مێژووە جیهانییە ڕەنگی زانیوەو بەکاریشی هێناوە لەوانە:-

١) کۆتەڵو بۆماوە دێرینەکانی گوندی (چەرمۆ)ن کە پێــش (٤٧٥٠) ســاڵ پێــش زایین دۆزراوەنەتەوە (هەندێکیان بە بۆیە سوورکراون)[17]. ئەم بەڵگەیە چەندین چەمکی زانستیشمان دەربارەی ڕەنگ پێدەبەخشێ کە بە بەڵگەی پێشــکەوتنی کۆمەڵی کوردەواری دەژمێردرێت.

٢) ئەو زەخرەفانەی لەسەر گۆزەو دیزەی کارە دەستییەکان بــۆ یــەکراون و ڕەنگــی جیاجیایان بۆ بەکار هێناون، بەڵگەی دووەمن.

لە کاتێکدا ئەو سەردەمە (بە سەردەمی گۆزەکــاریو دیزەکــاریی ڕەنگــاوەرەنگ ناوبراوە)[18] ئەمەش چەند خاڵێکی پڕشنگدار بۆ کۆمەڵکەی کوردەواری سەبارەت بە ڕەنگ دەستنیشان دەکات:-

(١٦) - یوهانس إیتن، ١٣٧٣، اخلاقیت در رنگ، ترجمة حسن ملجانی

(١٧) - ئەژی، ٢٠٠٠، هەزارمێرد، ژ١١، ل١٦٦.

(١٨) - یوسف زعلان، ١٩٧٠، اللون، العربي، ذ١٤٥، الکویت، ل١٢٤-١٢٥

أ- مرۆڤە کوردستانەیەکان (٢٧٥٠) ساڵ پێش نەتەوەکانی یۆنان و ئغریق ڕەنگی بەکارهێناوە بەو پێیەی کە بەکار هاتووەکان ناویان هەیە.

ب- ڕەنگی بۆ بۆیەکردن بەکار هێناوە.

ج- مرۆڤە کوردستانیەکان وشەی ئەو ڕەنگانەیان هەبووە کە بەکاریهی.

ئەم ڕاستییانە وادەکەن کە بتوانرێ وشەکانی ڕەنگ لە کوردیدا، بەپێی ئەو بیردۆزە جیهانییانە پۆل بکرێن کە ئەمڕۆ کاریان پێدەکرێت، ئەو ڕیزکردنانەش بەپێی بۆچوونی جیهانین، کە هەریەکەیان بنەمای زانستیی خۆی هەیەو بۆ ماوەیەکی زۆر پەیڕەوکراون ودەکرێن و کاریان لەسەر ئەنجام دراوە، ئەو بیردۆزانەش کە دەستنیشانی چۆنێتی لەدایکبوون و ڕیزبوونی وشەکانی ڕەنگ دەکەن، سێ بیردۆزن:-

**یەکەم) (وشەکانی ڕەنگ بە شێوەیەکی هەڕەمەکی ڕیزبوونە)[19]**

ئەم بۆچوونە پشت بەوە دەبەستێ، کە وشەکانی ڕەنگ لە زمانەکانی سەر گۆی زەویدا، بە یەك شێوەو یەك ڕیزبوونی یەك لە دوای یەك دروست نەبوونە، ژمارەی ئەم وشانەش لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەگۆڕێ، کەواتە مەرج نییە وشەی (سوور) لە هەموو زمانێکدا لە پاش لەدایکبوونی وەشەی سپیو ڕەش دروست بوبێت و لەم ڕووەشەوە پێش ڕەنگی زەرد کەوتبێ، بە واتایەکی کە ئەو مەرجە دانانێ کە دەبێ وشەکانی ڕەنگ (سپی-ڕەش) هەبن ئەوجا وشەی (سوور) سازبکرێ، ئەگەر نا هەر زمانێك وشەی ڕەنگی (سپی-ڕەش)ی نەبوو، ئەوا بەهیچ جۆرێ نابێ وشەی ڕەنگی سوورو ڕەنگەکانی کەی هەبێ، کەواتە ئەم بیردۆزەیە هیچ ڕیزبوونێکی مەرجیو لۆجیکیو ماتماتیکی یەك لە دوای یەك ناداتە وشەکانی ڕەنگ، بەڵکو بۆ ئەوە دەچێ کە بە شێوەیەکی هەڕەمەکیو بێبنەمای مەرجی وشەکانی ڕەنگ دروست بوونەو هەر

---

(١٩) - احمد مختار عمر، ١٩٨٢، اللغة واللون، لا ٢٠.

ئەمەش وایکـردووە ژمارەکانیشـیان لـە زمانێکـەوە بـۆ زمـانێکی دی جیاوازبـێ، بـە واتایەکی کە زۆر ئاساییە ناوی هەندێ ڕەنگ لە زمانێکدا هــەبێ‌و لـە زمـانێکی کـەدا نەبن، یان دەکرێ یەك ڕەنگ لە زمانێکدا چەندین ناوی هەبێ‌و لە زمانێکی کەشدا یـەك ناوی هەبێ، یان هەر ناویشی نەبێ، بۆ ئەمەش ئەو بەڵگەیــە ئەهێنینــەوە کـە هـەندێ زمان هەیە تەنها دوو وشەی ڕەنگی هەیە کە (ڕەش و ســپی)ن، ڕەنگـە تاریکـەکان بـە ڕەش ناودەبەن و ڕەنگە کاڵەکانیش بە سپی ناودەبەن.

## دووەم ) (وشەکانی ڕەنگ بەپێی ئەرکەکانیان ڕیزدەبن)[٢٥]

ئەم بۆچوونە بۆ ئەوە دەچێت کە سەرەتا ئەو وشانەی ڕەنگ دروســت دەبــن، کـە ڕەنگەکەی ئەرکی لە ژیانی نەتەوەکەدا ببینێ‌و بایــەخی خـۆی هـەبووبێ، کەواتـە ئەگـەر ڕەنگــی (شـین) لـەلای نەتەوەیـەك گرنـگ بووبـێ‌و کـاری کردبێتـە سـەر کەسەکانی، جا ئەو کارکردنە بە هەر هۆو بۆ هەر مەبەستێك بووبێ، ئــەوا وشـەی (شین) لە ڕووی لەدایکبوون و ڕیزبوونــەوە زووتـر ئـەنجامدراوەو پێـش ئـەو وشـانە کەوتووە کە گوزارشت لە ڕەنگ دەکەن، بەڵام لە ڕووی گرنگی‌و بایەخدانــەوە لـەناو ئەو نەتەوەیەدا لە پاش ڕەنگی (شین)ـەوە دێن و ڕیز دەبن.

ئەم بیردۆزەیە، پتر پشت بە کردارێتی ڕەنگو بەگەڕخشــتنی دەبەســتێ، کەواتـە کاتێك وشە بۆ ڕەنگ دادەنرێت کە ڕەنگە کە بە کردار خۆی بسەلمێنێ‌و تێکـەڵ بــە لایەنێك یان زیاتر لە لایەنەکانی ژیانی مرۆڤ ببێت، هەر ڕەنگێکیش ئەرکی نەبوو کاریگەریی کرداریی لەسەر ژیانی مرۆڤ نەبوو ئەوا ئەو ڕەنگە ئاوڕی لێنادرێتەوەو وشەی بۆ دانانرێ‌و ناچێتە ناو فەرهەنگی ئەو نەتەوەیەوە.

دیارە گرنگیی ڕەنگیش لەسەر نەتەوەکان و دواتریش هاتنە نـاوەوەی زمانــەوە، کارێکە پابەندە بە ژینگەو خودی ئەو مرۆڤانەی لەو ژینگەیــەدا دەژیـن، بەمــەش

---

(٢٥) - سەرچاوەی پێشوو، لا٢٠-٢١

دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە جۆرو گرنگیی ئەو ڕەنگانە لە ژینگەی شـوێنێکەوە بـۆ شوێنێکی کە دەگۆڕێ، کەواتە لەدایکبوون و ڕیزبوونی وشەکانی ڕەنگ لەسەر یەك ڕێگاو ڕێساو یاسا و بەیەك پلە نەهاتوون، دەرئەنجام لە زمانێکیشەوە بۆ زمـانێکی کە گۆڕان بەخۆیانەوە ئەبینن.

**سێیەم ) ( ریزبوونی وشەکانی ڕەنگ بەپێی شەبەنگ)**

(پۆلکردنی ڕەنگ لە هەموو زمانەکانی جیهاندا وەکو یەکن)[٢٦]

ئەم بیردۆزەیە ئەوە دەگەیەنێ کە ڕەنگەکان وەکو شریتێکی نەپسـاوی یـەك لـە دوای یەك وایەو ڕیزبوونەکەیان یەك جۆرەو وشەکانی ڕەنگ شوێن ناگۆڕن، ئەمـەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەر ڕەنگێك درێژیی شەپۆلی خـۆی هەیـەو سـنووری ئـەو درێژیو کورتیی شەپۆلانەش دیاریکراون و کاریگەرییان لەسەر چاوی مرۆڤ بـەپێی شەپۆلەکانیانە، ئەو شەپۆلانەش پێوانە دەکرێن و شوێنی دیاریکراوی یەك لـەدوای یەکیان هەیە. جگە لەوانەش شەبەنگ دیاردەیەکی سروشتییەو لە هەموو جیـهاندا بەیەك شێوەو ڕیزبوونەوە دەردەکەوێت و دەبینرێت.

ڕەنگەکانی شەبەنگیش جێگۆڕکێ ناکەن و یەك ڕیزبوونیان هەیە کەواتـە وەکـو مەرجی پێویستیو زانستی، ئـەوا ناونـانی ئـەو ڕەنگانـەی شـەبەنگ لـە هـەموو جیهاندا وەکو یەك ڕیزدەبن و بە هەمان شێوەی شەبەنگ دادەنرێن. ئـەم بۆچوونـە، تا ڕادەیەك بنچینەی زانستیی هەیەو تا ئەمڕۆش کـاری پێدەکـرێو لـە برەودایـە. مەبەست لە ڕیزبوونیش ئەوەیە کە ناوی یەکەم ڕەنگی شەبەنگت نا کە (سوور)ـەو بەرزترین درێژیی شەپۆلی هەیە، ئەوا لە دوای ئەو ڕەنگی (پرتەقاڵی) دێ، کە ناوی لێنرا ئەوە گومانی تێدا نییـە دەبـێ دوای ڕەنگـی سـوورو پـاش پرتـەقاڵیش لـە شەبەنگدا ڕەنگی (زەرد) دێ، کەواتە ناونانی ڕەنگی زەرد هەر لـە پـاش ڕەنگـی

---

(٢٦) - احمد مختار عمر، ١٩٨٢، اللغة واللون، لا ٢٠.

پرتەقاڵییەوە دێ   ئیدی بەم شێوەیە ڕەنگەکان لە هەموو زمانەکانی جیهاندا وەکو یەك ڕیز دەبن.

بەپێی ئەو سێ بیردۆزانەی کە خرانە ڕوو، دەردەکەوێ کە هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە هەندێ لە ڕەنگەکان ناویان هەیە، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە لە نێوان ڕەنگێکی شەبەنگ و ڕەنگێکی کەی نزیك بەو ڕەنگە چەندین ڕەنگ هەن کە پێیان دەگوترێ (ڕەنگەکانی گواستنەوە)[٢٢] ، کەواتە هەر ڕەنگێك لە ڕەنگەکانی شەبەنگ بگرین، دەبینین پلەی ڕەنگەکەی وردە وردە کەم دەبێتەوە هەرچەندە لە ڕەنگەکەی تەنیشتییەوە نزیك ببنەوە هێندە پلەکەی کەمتر دەبێ تا دەگاتە ئەو سنوورەی، ڕەنگی ئەوەی لە دوای ئەم دێ تێکەڵی دەبێت و بەلای ئەودا دەشکێتەوە، تا دەگاتە ڕادەیەك ئیدی ڕەنگە نزیکەکە وردە وردە دەستپێدەکات و هەتا بەرەو خاڵی ناوەند بڕۆین ئاشکراتر دەبێ، لە خاڵی ناوەندیشدا، کە پێی دەگوترێت (بیلبیلەی ڕەنگ)، لەم خاڵەدا ڕەنگەکە لە لوتکەدا دەبێت و هەر سێ مەرجەکان لە خۆ دەگرێ.

## چریسکە / بەها / تێری /

دەتوانین ڕەنگی ئەم خاڵە بە ڕاستەقینەترین و باشترین پلەکانی ئەو ڕەنگە دابنێین، لەم دیوو ئەو دیوی هەموو بیلبیلەیەکی ڕەنگدا، ئیدی کاڵبوونەوەو دابەزین دەستپێدەکا، کەواتە هەرچەندە لەو خاڵە دوور بکەوینەوە ئەوا لە شەبەنگدا بەرەو ڕەنگەکانی گواستنەوە دەڕۆین: وەکو لەم وێنەیەدا دەبینرێت:-

(٢٢) - سعد جبار البريص، ١٩٨٨، عمى الألوان، لا ٢٠




دیارە چاوی مرۆڤیش لە ڕووی تواناوە تا چەند دەتوانێت ڕەنگەکانی گواستنەوە ببینێت و لەیەکیان جیابکاتەوە! بۆ نموونە ئەگەر دوو ڕەنگی دراوسێی (زەردو سەوز) لە شەبەنگدا ببینرێن ئەوا لە نێوان خاڵی بیلبیلەی ڕەنگی هەردووکیاندا ژمارەیەکی لەبن نەهاتووی ئەو دوو ڕەنگە بوونیان هەیە، کە ڕادەی کاڵیو تێریی ئەو سێ مەرجە گرنگە دەسنیشانیان دەکات. دیارە نە چاو دەتوانێت ئەو ژمارە لەبن نەهاتووەی ڕەنگەکان ببینێت، نە هیچ زمانێکیش توانیویەتی وشە بۆ ئەو ژمارە زۆرانەی ڕەنگ دابنێت.




یەکەم کەس کە هەستی بە ڕیزبوونـی ڕەنـگ کردبـێ، زانایـەك بـوو بـە نـاوی (Lazarus Geiger) ئەمیش لە ساڵی ١٨٦٧دا توانی بیردۆزەکەی خۆی بخاتـە ڕوو بۆ ئەمەش (٦) (شەش قۆناغی پەرەسەندنی وشەکانی ڕەنگی دەستنیشانکردووە کە بەم شێوەیەن)[٢٣]:-

١) قۆناغی ڕەنگی ڕەش.
٢) قۆناغی ڕەنگی ڕەش و سوور.
٣) قۆناغی ڕەنگی ڕەش و سوورو زەرد.
٤) قۆناغی ڕەنگی ڕەش و سوورو زەردو سپی.
٥) قۆناغی ڕەنگی ڕەش و سوورو زەردو سپیو سەوز.
٦) قۆناغی ڕەنگی ڕەش و سوورو زەردو سپیو سەوزو شین.

ئەگەر تەماشای بیردۆزەکەی (Lazarus) بکـەین و نموونـەی قۆنـاغی سـێیەمی وەرگرین، ئەوا:-

ڕەنگی ڕەش = ڕەش + ڕەنگە تاریکەکان
ڕەنگی زرەد = زەرد + ڕەنگە ڕۆشـنەکان

(٢٣) - سعد جبار البريص/ سەرچاوەی پێشوو، لا٢١

لەم حاڵەتەدا ڕەنگی زەرد ڕووبەرێکی بەرین دەگرێتە خۆیو ڕەنگەکانی (سەوز + پرتەقاڵی + پەمەیی) دەکەونە ناو ئەوەوە، لەم حاڵەتەدا ڕەنگی زەرد =

ڕەنگی زەرد
ڕەنگی سەوز
ڕەنگی پەمەیی
ڕەنگی پەرتەقاڵی

لە ساڵی ١٨٧٧دا (Hugo magnus) پەرەسەندن و لە دایکبوونی وشەکانی ڕەنگی سپاردە دەستی گەشەسەندنی هەستی مرۆڤ، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو تۆژینانەوە سەریهەڵدا، کە لەسەر (١٦) شانزە زمانی جیاواز کردبووی، بەمەش گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە مەسەلەی هەستکردن بە ڕەنگ لەناو هەموو نەتەوەکاندا وەکو یەك وایە گەرچی ژمارەی وشەکانی ڕەنگیشیان جیاوازبن.

لە ساڵی ١٩٠١دا (W.H.Rivers)[٢٤] لەسەر بنچینەی ڕەنگ لەلای نەتەوەکان، وشەکانی ڕەنگی بەسەر چەند قۆناغێکدا دابەشکرد کە بە قۆناغەکانی (سێ وشەی ڕەنگ) ناوزەدکراوەنـ

قۆناغی یەکەم:-

وشەی یەکەم = ڕەش، شین، ئاوی، مۆر
وشەی دووەم = سپی، زەرد، سەوز
وشەی سێیەم = ڕەش، شین، ئەرخەوانی، پرتەقاڵی

قۆناغی دووەم:-

وشەی یەکەم = ڕەش، شین، ئاوی، مۆر، زەرد

قۆناغی سێیەم:-

وشەی یەکەم = ڕەش، سپی، سوور، زەرد، سەوز

---

(٢٤) - احمد مختار عمر، ١٩٨٢، اللغة واللون، لا٢٠.

## قۆناغی چوارەم:-

**وشەی یەکەم = ڕەش، سپی، سوور، زەرد ، سەوز، شین**

دیاره ئەم بیردۆزەیە کە وشەکانی ڕەنگی بەسەر ئەو چەند قۆناغەدا دابەشکردووە، ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەو وشانە بە ڕیزبوونێکی یەك لە دوای یەکی نەگۆڕ دەربازبوونەو مێژووەکانیان وەکو زنجیرەیەکی یەك لە دوای یەك وایە. ئەم بۆچوونی دابەشبوونە کاتێك گەیشتە لوتکە، کە هەردوو زانای ئەنترۆپۆلۆجی Berlin و Kay بیردۆزەکەیان بە بەڵگەی کاری مەیدانی سەلماندو توانییان کتێبێك بە ناونیشانی Basic color terms ١٩٦٩ بخەنە بەردەست، کە لەسەر (٩٨) زمان ئەنجامیاندا کەبەم شێوەیەبوو:-

| ز | ناوی ڕەنگ | ژمارەی ئەو زمانانەی ناویان لێناوە | ڕێژەی لە سەدا |
|---|---|---|---|
| ١ | سپی | ٢٠ | %١٠٠ |
| ٢ | ڕەش | ٢٠ | %١٠٠ |
| ٣ | سوور | ٢٠ | %١٠٠ |
| ٤ | سەوز | ١٩ | %٩٥ |
| ٥ | زەرد | ١٨ | %٩٠ |
| ٦ | شین | ١٦ | %٨٠ |
| ٧ | قاوەیی | ١٥ | %٧٥ |
| ٨ | ئەرخەوانی | ١٥ | %٧٥ |
| ٩ | خۆڵەمێشی | ١٤ | %٧٠ |
| ١٠ | پەمەیی | ١٣ | %٦٥ |
| ١١ | پرتەقاڵی | ١١ | %٥٥ |

ئەگەر تەماشای ئەم لێکۆڵینەوەیە بکەین دەردەکەوێ کە:-

١) ژمارەی وشەکانی ڕەنگ (١١) یازدە دانەن.

٢) وشەکانی ڕەنگ بە شێوەیەکی هەڕەمەکی ڕیز نەبوون.

٣) ڕیزبوونەکان یەك لە دوای یەکن و دەبێ هەموو زمانێ بەو ڕیزبوونەدا تێپەڕبێ کە بەحەوت قۆناغدا دەڕۆن:-

| | |
|---|---|
| قۆناغی یەکەم | ڕەش و سپی |
| قۆناغی دووەم | سوور |
| قۆناغی سێیەم | سەوز |
| قۆناغی چوارەم | زەرد |
| قۆناغی پێنجەم | شین |
| قۆناغی شەشەم | قاوەیی |
| قۆناغی حەوتەم | ئەرخەوانی، پەمەیی، پرتەقاڵی، خۆڵەمێشی |

(سەوز و زەرد) شوێن گۆڕکێ دەکەن

پەیوەندی نێوان ئەم قۆناغانەش وەکو کارێکی جیهانی بەم شێوەیە نەخشە دەکێشرێت:




بەپێی ئەم سەلماندنە هەر ڕەنگێك لەلای چەپەوە هەڵبژێرین ئەوا مەرجە پێش ئەو وشەی ڕەنگە وشەکانی لای ڕاستی ئەو وشەیە پێشتر سازبووبێ و بەکارهاتبێ بۆ نموونە ئەگەر لە زمانێکدا وشەی (شین) هەبوو ئەوا مەرجە لەو زمانەدا وشەکانی

پێش شین بە پێی قۆناغەکان هەبن وەکو (زەرد- سەوز- سوور- سپی- ڕەش) خۆ ئەگەر لە زمانێکدا وشەی (زەرد) هەبێ، ئەوا مەرجە کە لەو زمانەدا وشەکانی ڕەنگی (سەوز- سوور- سپی- ڕەش) هەبن. خۆ ئەگەر ئەو نەخشەیە بەسەر زمانی کوردیدا جووت بکەین ئەوا دەبینین ئەو وشانەی کە Berlin و Kay لەو زمانەدا هەڵیانهێنجاون و ڕیزبوونێکی قۆناغکارییان پێ بەخشیون، ئەوا هەر یازدەیان لە زمانی کوردیدا بە هەمان قۆناغە جیهانییەکاندا تێپەڕبوونەو ئەو یازدە وشانەش لە کوردیدا هەن ئەمەش بەخاڵێکی گەشی زمانەکە دەژمێردرێو دەبێتە پشتگیری بۆ سەلماندنەکانی Berlin و Kay.

لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردیدا زۆر جار (شین و سەوز) لە شوێنی یەکتری بەکاردێن، بۆیە دەکرێ ئەو بۆچوونە جیهانییەی کە Berlin و Kay پێی گەیشتوون جۆرە گۆڕانێکی بەسەردا بێت کە بەم شێوەیە دەیخەینە ڕوو:-




خۆ ئەگەر تەماشای هەر یازدە وشەکانی ڕەنگ بکەین کە بە بنچینەیی دانراون، ئەوا مەرجەکانی ڕەنگی بنچینەیی لە هەموویاندا نابینرێن، چونکە ئەو مەرجە جیهانییانەی کە دانراون بۆ ئەوەی بە ڕەنگێك بوترێ ڕەنگی سەرەکی ئەوا ئەمانەن:-

١) دەبێ وشەکە لە یەك مۆرفیم پێکهاتبێ.

٢) دەبێ واتای ئەو وشە یەك مۆرفیمیە لەناو وشەی کەدا دەرنەکەوێ، کەواتە بەشێك نەبێ لە واتای وشەیەکی کە.

٣) نابێ ئەو وشە یەك مۆرفیمە بـۆ شـتێکی تایبـەت و دیـاریکراو بـەکاربێ، بەڵکو دەبێ ببێتە سیفەتێکی گشتی.
٤) دەبێ ئـەو وشـە یـەك مۆرفیمیـە زۆر بـەکاربێت و لـە بوارێکـی تەسـکدا بەکارنەیەت.

کەواتە بـەپێی ئـەم پێوەرانـەی سـەرەوە دەبـێ وشـەکانی (قـاوەیی، پەمـەیی، پرتەقاڵی، خۆڵەمێشی) سەرەکی نەبن، چونکە لە یەك مۆرفیم ساز نەبوونە، ئــەوە نەبێ ئەم وشانە تەنها لە زمانی کوردیدا ناسادەبن، بە حوکمی ناسادەییشیان دەبێ ناوی ڕەنگـە سـەرەکییەکان نـەبن، چونکـە لـە زمـانی عەرەبیشـدا هـەمان شـتێ (قهوائی، أرجوانی، وردی، برتقالی، رمادی).
هەروەها لە زمانی کوردیدا چـەند وشـەیەکی کـە هـەن کـە لـە یـەك مۆرفیـم پێکهاتوون وەکو (بۆز، دێز، بۆر) بەپێی یاسای مۆرفیمی دەبێ ئەم وشانەی ڕەنـگ بە سەرەکی دابـنرێن و ڕەنگەکانیشـیان بـە سـەرەکی دابـنرێن، کـەچی لـە ڕووی بەکارهێنانەوە ئەم وشانە کەم بەکاردێن و بواری بەکارهێنانەکانیش تەسکن.
دیارە بۆ وشە ناســەرەکییەکانی ڕەنگیـش پێـوەری جیـهانی دانـراوە، کـە بـەم شێوەیەیە[٢٥]:-
١) وشەکە پێشتر ناوی شتێ بووبێ.
٢) وشەکە نوێ بووبێ.
٣) لە یەك مۆرفیم زیاتر سازبووبێ
بۆ نموونە ووشە (خاکی) لە (خـاك) ــەوە وەرگـیراوە، دیـارو مێژووەکـەی دوای ووشەی (خاك)ە. هەروەها بەپێی خاڵی سێیەمیش لە یەك مۆرفیم پتر پێك هـاتووە (خاك+ی). کەواتە ووشەی خاکی ناسەروکییە.

---

(٢٥) سەرچاوەی پێشوو،ل٣٧.

## وشەکانی ڕەنگ

بەپێی لێکۆڵینەوەکەی (بـــێرلن و کـــەی) ڕیزبوونـــی وشـــەکانی ڕەنـــگ، هـــەمان ڕیزبوونی ڕەنگەکانی شـــەبەنگ وەردەگـــرن و ژمارەشـــیان (٧) حـــەوت ڕەنگـــە، لـــە زمانی کوردیشدا، ناوی ئەو حەوت ڕەنگانەی شەبەنگ هەن و وشەیان هەیـــە، کـــە بەم شێوەیە ڕیزئەبن:-

(سوور، نارنجی، زەرد، سەوز، سەوزی شینباو، شین، مۆر) جگە لەوانەش (ڕەش و سپی) بە هەمان جۆر، بۆ مەبەستی ڕیزبـــوون و بایـــەخپێدانی ڕەنگـــەکان لـــەلای کورد، داوامان لە (٢٠٠) قوتابی زانکۆ (قۆناغی جیاجیاکرد)، کە بە ئازادی ناوی چەند ڕەنگ دەزانن بینووسنەوە، لە ئەنجامی ئەم ئامارەدا، هەرهەموویان ناوی ئەو حەوت ڕەنگەیان هێناوە، لەگەڵ ناوهێنانی ڕەنگـــی ڕەش و ســـپی، ئامارەکـــە بـــەم جۆرە بوو:-

| ڕێژەکەیان | ژمارەی ناوهێنان | ژمارەی ڕاپرسەکان | ناوی ڕەنگ | ژ |
|---|---|---|---|---|
| ٪١٠٠ | ٢٠٠ دانە | ٢٠٠ کەس | سوور | ١ |
| ٪١٠٠ | ٢٠٠ دانە | ٢٠٠ کەس | نارنجی | ٢ |
| ٪١٠٠ | ٢٠٠ دانە | ٢٠٠ کەس | زەرد | ٣ |
| ٪١٠٠ | ٢٠٠ دانە | ٢٠٠ کەس | سەوز | ٤ |
| ٪١٠٠ | ٢٠٠ دانە | ٢٠٠ کەس | سەوزی شینباو | ٥ |
| ٪١٠٠ | ٢٠٠ دانە | ٢٠٠ کەس | شین | ٦ |
| ٪١٠٠ | ٢٠٠ دانە | ٢٠٠ کەس | مۆر | ٧ |
| ٪١٠٠ | ٢٠٠ دانە | ٢٠٠ کەس | ڕەش | ٨ |
| ٪١٠٠ | ٢٠٠ دانە | ٢٠٠ کەس | سپی | ٩ |
| ٪١٠٠ | ٢٠٠ دانە | ٢٠٠ کەس | نیلی | ١٠ |
| ٪٨٢ | ١٦٤ دانە | ٢٠٠ کەس | پەمەیی | ١١ |
| ٪٦٨ | ١٣٦ دانە | ٢٠٠ کەس | وەنەوشەیی | ١٢ |
| ٪٦٨ | ١٣٦ دانە | ٢٠٠ کەس | قاوەیی | ١٣ |
| ٪٥٩ | ١١٨ دانە | ٢٠٠ کەس | زێڕی | ١٤ |
| ٪٥٥ | ١١٠ دانە | ٢٠٠ کەس | زەیتوونی | ١٥ |
| ٪٥٣ | ١٠٦ دانە | ٢٠٠ کەس | هەناری | ١٦ |
| ٪٤٩ | ٩٨ دانە | ٢٠٠ کەس | ئاسمانی | ١٧ |
| ٪٤٨ | ٩٦ دانە | ٢٠٠ کەس | باینجانی | ١٨ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٩ | خاکی | ٢٠٠ کەس | ٩٦ دانە | ٤٨٪ |
| ٢٠ | فستقی | ٢٠٠ کەس | ٩٤ دانە | ٤٧٪ |
| ٢١ | مارۆنی | ٢٠٠ کەس | ٩٢ دانە | ٤٦٪ |
| ٢٢ | شەکەری | ٢٠٠ کەس | ٩٠ دانە | ٤٥٪ |
| ٢٣ | کەکاوی | ٢٠٠ کەس | ٨٤ دانە | ٤٢٪ |
| ٢٤ | ئەرخەوانی | ٢٠٠ کەس | ٧٤ دانە | ٣٧٪ |
| ٢٥ | جەرگی | ٢٠٠ کەس | ٧٤ دانە | ٣٧٪ |
| ٢٦ | پیازی | ٢٠٠ کەس | ٧٤ دانە | ٣٧٪ |
| ٢٧ | شیری | ٢٠٠ کەس | ٦٦ دانە | ٣٣٪ |
| ٢٨ | خەنەیی | ٢٠٠ کەس | ٦٢ دانە | ٣١٪ |
| ٢٩ | نەوتی | ٢٠٠ کەس | ٦٢ دانە | ٣١٪ |
| ٣٠ | زیوی | ٢٠٠ کەس | ٦٢ دانە | ٣١٪ |
| ٣١ | بۆر | ٢٠٠ کەس | ٥٤ دانە | ٢٧٪ |
| ٣٢ | حەڵوایی | ٢٠٠ کەس | ٥٤ دانە | ٢٧٪ |
| ٣٣ | ژەنگار | ٢٠٠ کەس | ٥٢ دانە | ٢٦٪ |
| ٣٤ | شرووبی | ٢٠٠ کەس | ٤٤ دانە | ٢٢٪ |
| ٣٥ | خورمایی | ٢٠٠ کەس | ٣٦ دانە | ١٨٪ |
| ٣٦ | خەردەلی | ٢٠٠ کەس | ٣٦ دانە | ١٨٪ |
| ٣٧ | پیرۆزەیی | ٢٠٠ کەس | ٣٤ دانە | ١٧٪ |
| ٣٨ | گۆشتی | ٢٠٠ کەس | ٣٤ دانە | ١٧٪ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٣٩ | شەرابی | ٢٠٠ کەس | ٣٢ دانە | ١٦٪ |
| ٤٠ | بێجی | ٢٠٠ کەس | ٣٢ دانە | ١٦٪ |
| ٤١ | فیلی | ٢٠٠ کەس | ٣٠ دانە | ١٥٪ |
| ٤٢ | خومی | ٢٠٠ کەس | ٢٤ دانە | ١٢٪ |
| ٤٣ | باوی | ٢٠٠ کەس | ١٨ دانە | ٩٪ |
| ٤٤ | سیانی | ٢٠٠ کەس | ١٦ دانە | ٨٪ |
| ٤٥ | ئەسمەر | ٢٠٠ کەس | ١٦ دانە | ٨٪ |
| ٤٦ | ئاڵ | ٢٠٠ کەس | ١٢ دانە | ٦٪ |
| ٤٧ | قەوزەیی | ٢٠٠ کەس | ١٢ دانە | ٦٪ |
| ٤٨ | گورگی | ٢٠٠ کەس | ١٠دانە | ٥٪ |
| ٤٩ | چوێتی | ٢٠٠ کەس | ١٠ دانە | ٥٪ |
| ٥٠ | شێلم بە ترشی | ٢٠٠ کەس | ١٠ دانە | ٥٪ |
| ٥١ | هەنگوینی | ٢٠٠ کەس | ٨ دانە | ٤٪ |
| ٥٢ | فسفۆری | ٢٠٠ کەس | ٨ دانە | ٤٪ |
| ٥٣ | شەقەندەی | ٢٠٠ کەس | ٨ دانە | ٤٪ |
| ٥٤ | برۆنزی | ٢٠٠ کەس | ٨ دانە | ٥٪ |
| ٥٥ | چکلێتی | ٢٠٠ کەس | ٦ دانە | ٣٪ |
| ٥٦ | قەزوانی | ٢٠٠ کەس | ٦ دانە | ٣٪ |
| ٥٧ | گیایی | ٢٠٠ کەس | ٦ دانە | ٣٪ |

لە ئەنجامی ئەم ئامارەوە، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە، وشەکانی ڕەنگ جگە لەوانەی کە لە ڕووی پێکهاتنەوە سادەن و لە یەك توخم پێکدێن، وشەکانی کە پتر لە ڕەنگی بوونەوەرەکانی دەوروبەر وەرگیراون، وشە سەرەکییەکانی ڕەنگ کە لای (بیرلن و کەی) ناویان هاتووە، لەم ئامارەدا هەن.

## پێکهاتەی وشەکانی ڕەنگ

دەکرێ ووشەکانی ڕەنگ لەڕووی پێکهاتنەوە بەم شێوەیە پۆل بکرێن:-

### ١-وشەی سادە

ئەو وشانەن کە بۆ ڕەنگ دانراون و لە یەك مۆرفیمی ئازاد پێکهاتوون.

١. ڕەش- سیاو

٢. سپی - چەرمگ

٣. سوور-سۆر - سویر

٤. زەرد- زەر

٥. شین کەو-کەوە

٦. سەوز-کەسك

٧. مۆر

٨. بۆز

٩. دێز

١٠.ئاڵ

١١. بۆر

١٢-ئەسمەر

لێرەدا ئەوە دەردەکەوێ کە ژمارەی وشە سـادەکانی ڕەنـگ لـەلای کـورد (١٢)دانەن ، دەیان سەرەکین بەلاّم (بۆز/دێز)بە ناسەرەکی دادەنرێن چونکـە بـواری بەکارهێنانیان کەمە.

لە ڕووی بەشەکانی ئاخاوتنیشەوە، ئەم گرووپە ئاوەڵناون، بەلاّم لە هەمان کاتدا ناون بۆ ڕەنگەکانیان.

أ- کراسێکی مۆری لەبەردایە. مۆر = ئاوەڵناوە

ب- زەرد بە ڕەنگێکی سەرەکی دادەنرێ. زەرد = ناوە

## ٢) وشەی ناسادە

زۆربەی زۆری ئەو وشانەی گوزارشت لە ڕەنگ دەکەن و لە ڕەنگی بوونەوەرەکان وەرگیراون ناسادەن. وەکو:-

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەرخەوان + (ی | نیسبەت) | = ئەرخەوانی | = بە ڕەنگی ئەرخەوان |
| جەرگ + ی | | = جەرگی | = بە ڕەنگی جەرگ |
| خورما + ی | | = خورمایی | = بە ڕەنگی خورما |
| هەنگوین + ی | | = هەنگوینی | = بە ڕەنگی هەنگوین |
| باینجان + ی | | باینجانی | = بە ڕەنگی باینجان |
| نارنج + ی | | نارنجی | = بە ڕەنگی نارنج |
| پرتەقاڵ + ی | | پرتەقاڵی | = بە ڕەنگی پرتەقاڵ |
| چویت + ی | | چویتی | = بە ڕەنگی چویت |
| خامەک + ی | | خامەکی | = بە ڕەنگی خامەک |
| وەنەوشە + ی | | وەنەوشەیی | = بە ڕەنگی وەنەوشە |
| خاک + ی | | خاکی | = بە ڕەنگی خاک |

یان زیانی گەورەیان لێبکەوێ، ئەوا دەرو دراوسێ ئەڵێن: (بووکەکەیان پێو قدوومی ڕەشە)، کەواتە نەگبەتی ئەوە ئەمانیشی گرتەوە.

## ٧)- بەختی ڕەشە

کەواتە بەدبەختە، ئەم ئیدیەمە واتایەکی نێگوتیفانە ئەداتە پاڵ ئەو کەسەی پێی ئەوترێ (بەختی ڕەشە) کەواتە سەرکەوتن و شادمانی بەشی ئەو کەسە نییە بۆ نموونە دووکاندارێك برێك برنج بکڕێ بۆ ئەوەی قازانجی لێبکات، کەچی لەپڕ برنجێکی زۆر بکەوێتە بازاڕەوەو ببێتە مایەی دابەزینی نرخەکەی، ئەو کاتە دووکاندارەکە ڕووبەڕووی زیانێکی گەورە ئەبێتەوە، لەم بارەدا ئەڵێ: (خەتای کەس نییە من خۆم بەختەکەم ڕەشە).

## ٨)- ڕۆژی ڕەش

لێرەدا بە واتای ڕۆژی ناخۆش دێ، ئەو ڕۆژانەی کە خۆشی تێیدا ئەبێتە دانسقەو خۆری تاوا ئەبێ. ڕۆژی ڕەش بەو ڕۆژانە ئەوترێ کە پڕ لە کارەسات و ڕووداوی دڵتەزێنن و کاریگەرییان لە دڵو دەروونی مرۆڤدا ئەمێنێتەوە، کەواتە ڕەش لە بواری کات و ماوەدا بەکارهاتووەو لە واتاکەی خۆی دوورکەوتۆتەوە کە ڕەنگە، بۆ نموونە لە مێژووی میللەتی کوردا ڕۆژی ڕەش ئەو ڕۆژانە ئەگرێتەوە کە زیان و کارەساتی مەزنی لیٚ قەوماوە، دەکرێ بە ڕۆژانی ڕووخاندنی کۆماری (مەهاباد) بوترێ (ڕۆژانی ڕەش)، هەروەها جاری وا هەیە کەسێك تووشی تەنگ و چەڵەمە ئەبێت و ئەو ڕۆژە بە ڕۆژێکی ڕەش ناوئەبات، کەچی لەولاوە یەکێك هەڵی دەداتێو ئەڵێ: (ڕۆژی ڕەشت نەدیوە، ئەمە چییە؟) کەواتە ڕۆژی ڕەش ئەبێ ئەو ڕۆژە بێ زۆر ناناسایی‌و جگەربڕبێ، ئەم ئیدیەمە لە بواری دوعاو نزاکردنیشدا بەکاردێ وەکو ئەوترێ: (خوایە ڕۆژی ڕەشمان پیشان نەدەی)، مەحوی ئەڵێ:-

لەو ڕۆژەوە جودابووە لێم ئەو پەری وەشە[٥٢]
ڕۆژم ڕەشـە شـوعورو دڵم لیٚ بووە جودا

لە شوێنێکی کەدا ئەڵی:-

عیشق ئاگرێکە بەربووە هەر کەس دەبێ بە کەس(٥٣)
گەر ڕۆژە ڕەش وەکو شـەو بێ بوو بە شـــەوچراغ

## ٩)- ڕەشبین

بە واتای بەبێ هیوایی تەماشـای ژیـان ئـەکات و تروسـکەی ڕوونـاکی بـەدی ناکات، ئەو کەسانەی ڕەشبینن، هەمیشە لایەنە تاریکەکانی کارەکان و بوارەکـانی ژیان ئەبینن، بە ئەندازەیەك وا هەسـت ئەکـەن ئـەو بـوارە یـان ئـەو کـارە هیـچ بنەمایەکی چاکەو سەرکەوتنی تیا بـەدی نـاکرێو، هـەموو ڕێگاکـانی بەربەسـت کراون، مرۆڤی ڕەشبین حەز بە ژیان ناکات و هەردەم شکات لە ڕووداوەکان ئەکات، هەروەها بە واتای ئەنجامی خراپ دێ، بۆ نموونە ئەڵێ: (من ڕەشبینم بەرامبەر بـەم هەنگاوانە) کەواتە وا ئەبینم کە هەنگاوێکی باشـت نـەنابێو ئەنجامەکـەی خـراپ بێت.

## ١٠)- ڕەشبگیر

بە واتای هەموو کەسێك بەبێ جیاوازی بەردەکەوێ، ئـەم ئیدیەمـە لـە بـواری زەبروزەنگ و غەدرکردن و گرتندا بەکارئەهێنرێت، زۆر جار لە ئەنجامی ڕووداوێکدا دەسەڵات بە شێوەیەکی هەڕەمەکی خەڵکی ئەگرن، بۆ ئەوەی بگەنـە سـەرەداوێك، بەو جۆرە گرتنانە ئەوترێ (ڕەشبگیر) کەواتـە بـاش و خـراپ، بێتـاوان و تاوانبـار

(٥٢) - مەلا عەبدولکەریم مدرس، ١٩٨٤، دیوانی مەحوی، لا٧

(٥٣) - سەرچاوەی پیشوو، لا١٧١

ڕاپێچ ئەکرێن و ئەیانگرن بەبێ ئەوەی جیاوازی لە نێوان کەسێك و کەسێکی کـەدا بکرێت، یان ئەوترێ (ڕەشبگیرێکە، ئەمسەرو ئەوسەری دیارنەبێت).

## ١١)- ڕەش پۆش

بە واتای تازێ بار، لە کۆمەڵی کوردەواریدا ئەگەر کەسێك مردوویەکی نزیکـی مرد، ئەوا وەکو نیشانەیەك بۆ دڵتەنگیو ناخۆشی، جلوبەرگی ڕەشی بۆ ئەپۆشـێ، کەواتە ڕەش پۆش ئەو کەسـەیە کـە جلوبەرگەکـەی لـە ئـەنجامی تـازێ باریـیەوە ڕەشـکردووە، هـەروەها بـە واتـای ئـەوە دێ کـە ئـەم جلـە نیشـانەی ناخۆشـیو کۆسـکەوتنێکی کاریگـەرە لەسـەر دڵو دەروونـی ئـەو کەسـەو نیشـانەی دوورکەوتنەوەیە لە خۆشیو چێژەکانی ژیان، وەکو لەم فۆلکلۆرەدا ئەڵێ:

**مـن کە ڕەشپۆشم ڕەشێ لە بانی** (٥٤)
**تـازێ بـاری تـۆم نابێ نەیزانی**

## ١٢)- ڕەشیکردەوە

بە واتای سڕینەوەو شوێنەوار نەهێشتە، یەکەمیان لە بواری نووسیندا دێ، ئـەم ئیدیەمە چەند واتایەکی هەیە، لەوانە:-

**أ - دەفتەرێکی ڕەشـکردەوە = پڕکردنەوە**

زۆر جار کە یەکێك خەریکی نووسین ئەبێو دەست لە نووسین هەڵناگرێ، تاوەکو دەفتەرێکی (١٦) لاپەڕەیی یان پتر، پڕدەکاتەوە، لـەم بـارەدا ئەگـەر گفتوگۆیـەك سازبکرێ بەم چەشنە ئەبێ:-

**- ئەوە چییە، هەر خەریکی نووسینی!**
**- چەنت نووسیوە؟**

---

(٥٤) - گۆرانیی فۆلکلۆر

- ئیشەکە وا ئەخوازێ.
- (١٦) شانزە لاپەڕە.
-دەبلێ، دەفتەرێکم ڕەشکردۆتەوە.　　　　ڕەشکردنەوە = پڕکردنەوە

ب- خەتەکەی ڕەشـــکردەوە = سڕینەوە

ئەمەش بۆ کوژانەوەی ئەو نووسینانە ئەبێ، کـــە مەبەســتی نووســەرەکە نییــە بمێنێ، ڕەشکردنەوەش، یان خەتی بەسەردا دێ تا نەخوێندرێتەوە، یــان ئەوەیــە بــە لاستیك دەیکوژێنێتەوەو سپی دەکات، وەکو:-

- هەر پێنج پرسیارەکەم وەڵام دایەوە.
- خۆ داوای وەڵامی چوار پرسیاری کردبوو.
- دوایی، پرسیاری سێیەمم ڕەشکردەوە.　　　　ڕەشکردنەوە = سڕینەوە
- چۆن سڕیتەوە. یان خەتت بەسەرا هێنا؟
- نەوەڵا خەتم بەسەرا هێنا

ج- ئاواییەکەی ڕەشکردەوە = نەمان وکوێربوونەوە

هەندێ جار بە واتای کۆبرکردنەوەی شوێنەوارو حەتەری بنەماڵەو ئاســەوار دێ، وەکو چۆن بلێیی:-

أ- شوێنەوارتان ڕەشبێتەوە.　　=　　نەمان و کوێربوونەوە

ب- ئاسەواری ئاواییەکەشی ڕەشکردەوە.

### ١٣)- نوك لووت ڕەشكردن

بە واتای خۆبەپەندكردن دێ، ئەمەش بۆ بوارێك بەكاردێ، كە كەسێك كـارێكی زۆر شوورەییو ناشیرین و پڕ لە شەرمەزاریی بكات یان لە دەستی دەرچێ، ئەوا لـە پاداشتی ئەو كارە نالەبارەدا پێی ئەوترێ، (هەقە نوك لووتی خـۆی ڕەشـبكاو لـەم وڵاتە دەرچێ) ئەمەش لەبەر ئەوەیە كە لووت ڕەمزی سەربەرزییەو نیشـانەی فـیزو خۆ بە زلزانینیشە، كەواتە ئەگەر لووت ڕەشكرا كەواتـە ڕەمـزی سـەربەرزییەكەی لەككەدار ئەكرێو هەموو كەس ئەیبینێ، كە شوورەییەكی لە دەس قەوماوە.

### ١٤)- ڕەش و سپی لێك جیادەكاتەوە

بە واتای تێدەگا، كە پێچەوانەی (ڕەش و سـپی لێـك جیاناكاتـەوە) بـە واتـای تێناگاو خراپەو چاكەی خۆی نازانێ، ئەمە بەو مرۆڤانە ئەوترێ كـە زۆر بێعـەقڵن، دیارە ڕەنگی ڕەش و ڕەنگی سپی دوو ڕەنگی ئەوتۆن كە پێچەوانەی یەكدین، ڕەش مەرگی ڕەنگەكانەو سپی لەدایكبوونی ڕەنگەكانە، مرۆڤێك ئەم دوو ڕەنگـی لێـك جیانەكاتەوە ئەوا چاكەو خراپەی خۆشی نازانێ، هەروەها بە واتای سـنووری نێـوان ڕەش و سپی بەیانی دێ.

### ١٥)- (قولی-قوونی) ڕەش و سپی لە بواردا دەردەكەوێ.

دیارە هەر كەسێ لە ئاو بدات دەبێ خۆی هەڵبكا، كە خۆشـی هـەڵكرد قـاچ و قولی بەدەردەكەوێ، ئەوكاتەش دەردەكەوێ كە قاچی ناشیرینە یان جوانە، هەروەها بۆ بواری تواناو بێتواناییی بەكاردەهێنرێ، بۆ نموونـە یـەكێك دەیـەوێ پرۆژەیـەكی زانستی ئەنجام بدات و تۆ پێی بڵێی ئەم كارە لە توانای تۆدا نییەو بۆت بارنـاكرێ، ئەمیش لە وەڵامدا ئەڵێ: (قولی ڕەش و سپی لە بواردا دەردەكەوێ) كەواتە توانـاو داتوانایی من لەم بوارەدا دەردەكەوێ، بە واتایەكی دی، بە چـاوی خـۆت دەیبینـی چەند بە توانام.

**١٦)-تووشی ( - )ــــە ڕەشی خۆی بووە.**

دیارە هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی مرۆڤ بەشێکە لە پێکهاتــەی بـایۆلۆجی ئەو مرۆڤەو بە ئاسانی ناتوانێ دەستی بەرداری بــێو لــە خــۆی بکاتــەوە، چونکـە هەریەك لەو ئەندامانە کاری تایبەتی دەبینــن و بــەردەوامی بــە ژیـانی مرۆڤەکـە ئەدەن، بۆیە ئەگەر ئەو ئەندامەش ناشیرین بێ ئــەوا لــە ژێــر دەســەڵاتی کەســەکە خۆیدا نییە کە لایبدات و یەکێکی جوانتر یان باشتر بخاتە جێگاکەی، لەبــەر ئــەوە ئــەو ئەندامانــەی لــەش هــەتا مــردن بــە مرۆڤــەوە دەنووســێن و دەبــێ بەرگــەی ناشیرینەکانیشیان بگری، ئەم ئیدیەمە بە واتای تووشی کەسێ یان شتێ بــووە کــە ئیدی بە ئامان و زەمان لە کۆڵی ناگەڕێو وازی لێناهێنێ، بەو کەسانەش دەگوترێ (قیرسچمە) کەواتە وەکو قیری ڕەش کە پێتەوەنووسا ئیتر بە ئاسانی لێت نابێتەوە، بە ئەندازەیەك هەتا بێزارت دەکات.

**١٧)- ڕەش هەڵگەڕا**

ئەم ئیدیەمە بە چەند واتایەك دێ، ئەم واتایانەش بــەپێی بوارەکــان دەگۆڕێــن، وەکو:-

أ- ئەگەر یەکێك نەخۆشییەکی سەخت بگرێو ڕەنگی تێکبچێ.

ب- ئەگــەر یــەکێك لەبــەر کــارو کاســبی ماندووبــێو زۆر ڕابکــاو پیانــەگاو ماندووبوونەکەی پێوە دیاربێ بۆ نموونە ئەگەر بەو کەسە بڵێی چۆنی؟ ئــەوا لە وەڵامێکی پڕ لە بێزاریدا دەڵێ: (نامبینی چۆن ڕەش هەڵگەڕاوم، شــەوو ڕۆژ کار ئەکەم فریای هیچ ناکەوم).

**١٨- قوڕە ڕەشی دەرهێنا**

أ- به ناخی قوڕە ڕەشیا برد، بە واتای فەوتانی وەکو:- (ئیدی ئەم ڕۆژگارە، خــوا نەکات لە یەکێك هەڵبپێچێت، ئەوە بە ناخی قوڕە ڕەشیدا دەبات)[٥٥].

---

(٥٥) - جەلیل کاکەویس، خاکە لێوەی زێرانذۆڵ، ڕامان، ژ٣٢، ل١٤٦

ب- قوڕە ڕەشی دەرهێنا، بە واتای هەموو شتەکانی زانیو ئاشکاریکرد، بۆ نموونە باس لە شتێك دەکەیو ناوی کەسێك دێنی، بـەڵام ناتـەوێ بڵێـی ئـەو کەسـە چۆنەو چۆن نییە، کەچی بەرامبەرەکـەت هەڵئـەداتیو نهێنییـەکانی ئاشـکرا دەکات، لەو حاڵەتەدا پێی دەڵێـی: (قـوڕە ڕەشـت دەرهێنـا)، کەواتـە ئەمـە ئەوپەڕی مەسەلەکەیەو ئاشکرات کرد.

## ١٩)- ئاڵای سپیی هەڵکرد

سپی خۆی ڕەنگی ئاشتییە، بەڵام ئاڵای سپی، بە واتـای خۆبەدەسـتەوەدان بـە دوژمن یان بە بەرامبەرو کۆڵدان و وازهێنان لە بەرگریکردن دێ، ئەم ئیدیەمـە بـۆ بواری کێشەی نێوان لە کەسێ پتر یان گرووپ و دەوڵەتێ زیـاتر دێ، لـە،کـاتێکدا ڕەنگی سپی ئاشتی بەخشە، کەچی ئاڵای سـپی بێتوانـاییو دەسـت هـەڵگرتن لـە خەبات بـۆ شـتە پیرۆزەکـانی لای ئـەو کەسـە یـان ئـەو گـرووپ و دەوڵەتـە دێو واتایەکیلاوازی نێگەتیفانەی هەیە گەرچی لە ڕووی لۆجیکییەوە واز لە شـەڕهێنان دبێ واتایەکی پۆزەتیفانەی هەبێ، کەواتە بەو پێیە دەبوو (ئاڵای سـپی هـەڵکردن) جێی ڕێزو گەورەییو لێبوردن بێ، کەچی لە زۆربەی جیهاندا ئەم ئیدیەمـە بدرێتـە پاڵ هەر ولاتێك ئەوا ئەو ولاتە بە لاوازو ترسـنۆك لەقەڵـەم ئـەدرێ، چونکـە ئـەم ئیدیەمە بەو واتایە بەکاردێ، هەروەها بـە واتـای (وازهێنـان) دێ بـۆ نموونـە دوو کەس لە کارگەیـەکدا بەشـدارن، کێشـەیەکی دارایـی لـە نێوانیـاندا ڕوو ئـەدات، یەکێکیان لەم لاو لەولا قسە دەکات و هاتوچۆی دادگا دەکات و دنیا دەورووژێنێ، کەچی پاش ساڵێك یان دوو ساڵ ئەگەر لێی بپرسیو بڵێی: (ها کێشەکان گەیشـتنە کوێ؟) لە وەڵامدا دەڵێ: (مـن لە مێژە ئاڵای سپیم هەڵکردووە)، کەواتـە وازم لـەو کێشەیە هێناوە.

## ٢٠)- دەست و پێی سپییە.

ئەم ئیدیەمە بە واتای ئەوە هاتووە، کە ئەو کەسە هیچ نازانیو سـەر لـە هیـچ شتێك دەرناکات، واتایەکی نێگەتیفانە دەبەخشێ. لەکاتێکدا دەست و پێی مرۆڤ ئەگەر سپی بێت، ئەوا دەبێ جوانی بەخش بێت و ئەو کەسـە پەسـەند بێـت، ئـەم

ئیدیەمە ئەگەر درایە پاڵ ئافرەت و پێی وترا (فلانە کەس ئافرەتێکی دەست و پێ سپییە) ئەوا لێرەدا بەو مەبەستە دێ کە سەر لە کاروباری ناوماڵ دەرناکات و ناتوانێ ئەرکەکانی ماڵەکەی ڕاپەڕێنێ و سیفەتی کۆڵەوارو دەسەپارچەیی دراوەتە پاڵی، خۆ ئەگەر ئەم ئیدیەمە بدرێتە پاڵ پیاو، ئەوا مەبەستی نەزانین و سەردەرنەکردنی ئەو کەسە دەگەیەنێ، لەو بوارەیدا کە قسەی لێ دەکرێ، ئەمەش لەوەوە هاتووە، هەر کەسێك ئیشوکار نەکات و نەچێتە ناو بوارەکانی ژیانەوەو کۆششی خۆبەخێوکردن نەدات، ئەوا ئەو کەسانە دەست و پێیان سپی دەبێ و زەبری کارو ژینگەکانی کارکردن کاریگەرییەکیان لەسەر گۆڕینی سپێتی دەست و پێی ئەو کەسانە نابێ.

## ٢١-چاو سپی بوون( ٥٦ )

به واتای مردن دێ، ئەمەش لەوەوە هاتووە کە مرۆڤ دەمرێ چاوی دەسووڕێ و ڕەشێنەکەی بەسەر دەکەوێ و سپێنەی چاوی بەدەردەکەوێ کەواتە زۆربەی مردوو ئەگەر پێڵووی چاوی هەڵبدەیتەوە ئەوا چاویان سپییەو ڕەشی بەدی ناکرێ، کە دەڵێی (خەریك بوو چاوم سپی بێ) کەواتە (خەریك بوو بمرم)، دیارە ماندووبوونی زۆریش بە سنووری گەیشتنە مەرگ ئەم ئیدیەمە دەخوازێ.

سەرەڕای ئەو واتایە (چاو سپیبوون) بە واتای کوێری دێ، دیارە زۆربەی زۆری ئەوانەی کوێر ئەبن ڕەنگی ڕەشێنەی چاویان دەگۆڕێ و تانەی سپی بەسەر چاویاندا دێ، سنووردانان لەنێوان واتای (کوێربوون و مردندا) ژینگەی ئاخاوتنەکە دەریدەخات، وەکو مەحوی ئەڵێ:

من دەڵێم شەو بوو بە ڕۆژ، نەفسم دەڵێ ڕۆژ بوو بە شەو[٥٧]

---

(٥٦)- فەتاح مامە عەلی، سەرچاوەی پێشوو، لا٧٢. ئەم ئیدیەمە بە واتای ماندووبوونی لێکداوەتەوە.

(٥٧) - مەلا عەبدولکەریم مدرس، ١٩٨٤، دیوانی مەحوی، لا٢٤٣.

ئـــەو موحیبە، چونکە چاوی پێ سـپی بوو، من غەڵەت
سپی بوو = کوێر بوو
وەك داغـــی غـــەم نییە سـپیە داغـــی ئینتضـار[58]
چـاوم ببینــە، چاوە ؟ کـــە موطبقیـە تـی بـە یاضـی

## ٢٢ )- ڕوو سپی بوون

ئەم ئیدیەمە دوو واتای دژ بە یەکیان هەیە کـە بـە تـەواوی بەرامبـەر بەیـەك دەوەستنەوە، کە بەم جۆرەن:-

أ- لە کوردستانی خۆماندا بـــە واتـای سـەربەرزی دێ، بـە زۆری لـە بـواری دووعـای چاکـەکردندا بـــەکار دێـت و تەنــهاو تەنــهاش بـــۆ مێینــە بەکاردەهێنرێت، ناکرێ ئەم ئیدیەمە بخەینە پاڵ نێرینە، بۆ نموونە ناکرێ بە پیاوێ بڵێی (ڕووت سپی بێت) لە کاتێکدا پیاویش وەکـو ژن ڕووی هەیـە، خۆ ئەگەر کەسێك ئەم ئیدیەمە بداتـە پـاڵ پیـاوێك، ئـەوا بـە مەبەسـتی سووکایەتیکردن و واتاکەی بە ئەندازەیـەك خـراپ و نادروسـت ئـەبێ کـە وەرناگیرێ.

دیارە لەم حاڵەتەشدا دەبێ ڕوو سـپێتی ببەسـتین بـە پـەردەی کچێنییـەوە، چونکە پەڕۆی شەوی بووکێنی بە ڕەمزی سەربەرزیو پاکیو ڕەوشـت بـەرزی دادەنرێو لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا پێی ئەوترێ (پـەڕۆی ڕوو سـپێتی) هەر لەبەر ئەمەش ناکرێ ئیدیەمی (ڕوو سپی بوون) بدرێتە پاڵ نێرینە.

ب- لە کوردستانی ئـێران، واتـای ئـەم ئیدیەمـە گـۆڕاوە، وشـەی سـپی بـە واتای نێگەتیفانە کاری خۆی کـردووەو نـەیتوانیوە ببێتـە ڕەمـزی پـاکیو خاوێنیو سەربەرزی، بەڵکو بە واتای (خراپەکاری) دێ، دیارە ئەمــەش بـۆ ئـەوە هـاتووە کـە نـاوی خراپـەکاری نـەهێنن و لـەو وشـە ترسـناکە کـە

(٥٨) - سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٧.

زیانبەخشە کۆمەڵایەتییە دووریکەونەوە، ئەمەش بەکارهێنانی دژە واتایە، خۆ ئەگەر لە کوردستانی ئێران بە ئافرەتێك بڵێی (یاخوا رووت سپی بێت) ئەوا ئەم دووعایە بەچاکە ناکەوێتەوەو دەقاو دەق دژی واتــای لقــی (أ)ـــە چونکە واتــای ژێــرەوە مەبەســتی ((یــاخوا ڕوو ڕەش بــی)) دێــت کەواتــە ڕووڕەشی ئافرەتیش بە واتای ببیتە ئافرەتێکی خراپــەکار، مــەحویش (ڕوو سپی)ی بۆ ئەم واتایە بەکارهێناوە:

چـــاوەکـــەم مـــەنـــوارە ڕەنگی ظاهیری[٥٩]
خۆ دەزانی (ڕوو سپی) چەند ڕووسیان

ڕووسپی = خراپەکار (سۆزانی)



## ٢٣ )- بەختی سپییە

بە واتای بەخت باشی دێ، لێرەدا وشەی سپی لایـــەنی پۆزەتیفانــە دەبەخشــێو ئیدیەمەکە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەوەوە، مرۆڤی بەخت سپی ئەو کەسەیە کــە هەموو شتەکانی ڕاست بۆ دێو ژیان بە گوێرەی دڵــی ئــەو دەڕوات و ئامانجــەکانی دێنە دی، ئەم ئیدیەمە پێچەوانەی واتای (بەختی ڕەشە) دەوەستێتەوە، کە هەردوو وشەکانی ڕەنگ بۆ واتاکانی خۆیان بەکارنەهاتوون و واتای کەیان بەخشیوە.

## ٢٤ )- پرچی سپی هۆنینەوە[٦٠]

ئەم ئیدیەمە بە واتای پیربوون دێ، بەڵام نەك پیربوونێکی سروشتی کە ئەنجامی تەمەنی هەموو کەسێك هەر بەرەو پیرییە، بەڵکو پیرییەك بە ڕەبەنیو بێ شووکردن بێو تەنها بۆ مێینەو لە بواری دووعاکردن و بەزەییدا بەکاردەهێنرێ، وەکو:-

(٥٩) - مەلا عەبدولکەریم مدرس، دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو، لا٣٢٦

(٦٠) - فەتاح مامە عەلی، سەرچاوەی پێشوو، لا٨٣

- یا خوا کچم پرچی سپی بهۆنیتەوە. بە واتای شووکردنت بە نسـیب نـەبێو هەر بە کچی بمێنیتـەوە تـا سـەرت سـپی دەکـەیت و پرچـت بـە سـپێتی دەهۆنیتەوە، لە کاتێکدا جوانییەکانت هـەڵوەریون، بـۆ ئـەوەی لـە کـاتی هۆنینەوەدا خەم بخۆیت و بزانیت ژیانت لەدەستچووە.
- بە دیار هەردوو منداڵەکانییەوە پرچی سـپی هۆنییـەوە، کەواتـە ئـەو ژنـە مێردەکەی نـەماوەو بـەدیار هـەردوو منداڵەکانییـەوە دانیشـتووەو شـووی نەکردۆتەوەو جوانیی خۆی کردۆتە قوربانی ئەوان، تا گەیشتۆتە ئـەوەی بـە دیاریانەوە پیربێ، بەپێی ژینگەی قسەکردن دەکرێ بـۆ دڵسـۆزی یـان بـۆ بێعەقڵی ئەو کەسە لێکبدرێتەوە، بەڵام بەهەر حاڵ لەناو کوردەواریـدا ئـەم جۆرە خۆ پیرکردنە بە هەڵوێستی مەردانەو دڵسۆزانەو لـەخۆبوردن لەقەڵـەم ئەدرێ.

ئەم ئیدیەمە نادرێتە پاڵ نێرینە، گەرچی پیـاویش پـیر دەبێـت و پرچیشـی سپی دەبێت، دیارە لە کۆمەڵی کوردەواریدا شوونەکردنی کچ و مانەوەی بـە زیانێکی گەورە دەژمـێردرێت، کـەچی ڕەنگـە بـۆ ژن نـەهێنانی پیـاو ئـەم لێکدانەوەیەی بۆ نەکرابێ.

## ٢٥ )- قیری کەوای سپییە.

بە واتای کە پێتـەوە نووسـا ئیـدی لێـت نابێتـەوە، ئـەم ئیدیەمـە بـۆ بـواری سووربوون لە سەر شت و درێژدادرێ دێ، بۆ نموونە هەندێ هەن کە کاریان دەکەوێتە لای هەر کەسێ ئیـتر شـەوو ڕۆژ وازی لێناهێنـێو هێنـدە دەچێتـە سـەری ناچـار کارەکەی بۆ جێبەجێ ئەکا، جا ئەگەر بپرسیو بڵێی: ئەوە بۆ ئیشەکەت بۆ کرد؟ لە وەڵامدا دەڵێ: چی بکەم، خۆ ئەڵێی قـیری کـەوای سـپییە، ناچـارت دەکـات کـە کارەکەی بۆ بکەی.

هەندێ کەسیش هەن هەر ئەوەندەی دەمیان بکەیتەوە، ئیدی هەندە دەڵێن نایبڕنەوەو واز لە قسەکردن و لەسەر ڕۆیشتنی بابەتەکە ناهێنن، بەو کەسانەش ئەوترێ (ئەڵێی قیری کەوای سپییە).

**٢٦ )- ڕدێن سپی ( ڕیش سپی ).**

بە واتای پیاوی گەورەی ئێمەیە، بۆ نموونە دەڵێی (فلان کەس ڕیش سپیی هۆزەکەمانە) بە واتای ئەو کەسە بە گەورەی هۆزەکەی ئێمە دانراوەو هەموومان بە قسەی ئەو دەکەین، کەواتە لێرەدا وشەی سپی بواری تەمەنی گرتۆتە خۆی نەك ڕەنگ.

**٢٧ )- پۆپ سپی**

بە واتای مرۆڤی قەیرە دێ، خۆ ئەگەر یەکێکی بە تەمەن کارێکی ناوێزەی لە دەست دەربچێ ئەوا پێی ئەوترێ (خۆ تۆ لای خۆت، پۆپت سپیکردووە) کەواتە تۆ بە تەمەنیو قەیرەی ناکرێ کاری وا لە کەسانی وەکو تۆ ڕوویدات.

**٢٨ )- سەری لە بەر خۆر سپی نەکردووە.**

کەواتە بە گاڵتە پیر نەبووە، بەڵکو لە ئەنجامی تەمەنێکی دوورو درێژی پڕ لە تاقیکردنەوەی ژیان ئەم نادگارەی لەلا دەرکەوتووە، ئەمە لە بواری جەختکردن لەسەر بەتواناییدا بەکاردەهێنرێ، ئێمە دەزانین کە خۆر هۆکارێکی سەرەکییە بۆ کاڵکردنەوەو بەرەو سپیبوونی ڕەنگەکان، بەڵام سەر سپیکردن لە ڕێگای ئەم هۆکارەوە نییە، بەڵکو هۆکارەکانی ژیان و ساڵانی تەمەنن، ئەمانەش مایەی شانازین کە مرۆڤ خۆی پێیانەوە هەڵبنێ، هەر ئەمەش وایکردووە بۆنی جۆرە شانازییەك لەم ئیدیەمەدا بکرێ.

## ٢٩ )- ڕۆحی سپییە.

کەواتە ڕۆحی پاکەو مرۆڤێکی بێ گوناھ و بێ فرت و فێڵە، لە ڕاستیدا یەکێك لە سیفەتەکانی ڕۆح پاکییە، جا کە ئەو سیفەتە پارێزرا، ئەوا ئەو کەسە بە مرۆڤێکی بێ زیان و بێ مەرامی خراپەکاری لەقەڵەم ئەدرێ، بەمەش لایەنی پۆزەتیفانەی دەخرێتە ڕوو.

## ٣٠ )- دەس و دڵ سپییە.

بە واتای دەسپاك و دڵپاك دێت، دەسپاکیش بە واتای دز نییەو دەس بۆ ماڵی حەرام و ماڵی کەس نابات، دڵپیسیش بە واتای ڕك و کینەو خراپەی لە دڵدا نییەو حەز بە زیانی کەس ناکات، ئەگەر شتێکیش بڵێ نیازی پاکەو مەبەستی خراپی لە دواوە نییە، دەکرێ واتای ئەم ئیدیەمە لەم هاوکێشەیەدا ڕوون بکرێتەوە.




## ٣١ )- دەم سپی

بە واتای نەزان و نەفام دێ، ئەم ئیدیەمە دەدرێتە پاڵ ئەو کەسانەی قسە بەپێی ڕێو شوێن ناکەنن و سنوور دەبەزێنن و بە هەڵە شیو هەڵەکردن مەبەستەکان دەدرکێنن، کارەکانیان هەرزەیی پێوە دیاردەبێ، بۆ نموونە ئەگەر قەرزت لای یەکێ بێو کوڕەکەت بنێری بۆ داواکردنی قەرزەکەت، ئەویش بە شێوەیەکی ناشیرین داوای قەرزەکە بکاتەوە، کابرای قەرزار دەڵێ (ئەو دەم سپییە چی بوو ناردبووتە سەرم؟!).

### ٣٢)- ڕەش و سپی نابوێرێ.

کەواتە هەموویان دەداتە بەر و جیاوازی لە نێوانیاندا ناکات و دەست ناپارێزێ.

### ٣٣)- سپیاتی چاوی دەرێ.

بە واتای (غصباً ما عليك)ی عەرەبی دێ، کەواتە ئەمە لە بواری هەڕەشەو شەڕکردندا بەکاردێ، کە هیچ حیسابێ بۆ بەرامبەر نەکەیت و منەتی نەزانیو خۆت بە هێزی خۆت کارەکە ئەنجام بدەیت، بەبێ ئەوەی گوێ بدەیتە بەرامبەرەکەت، لە کاتێکدا ئەو زۆری پێناخۆشە کە ئەو کارە ئەنجام بدرێ بەو جۆرەی کە تۆ ئەتەوێ.

### ٣٤)- ناوچەوان قەش.

کەواتە خۆی نەگبەتە و بەدبەختە، قەش بە واتای سپی دێ، ئەو ئاژەڵانەی ناوچەوانیان سپییە پێیان ئەوترێ (قەش)، ناوچەوان قەشیش لە دوورەو دیارەو بەسەردەکرێتەوەو دەناسرێ، ئەمەش وای لێدەکات کە هەردەم لەبەرچاوبێو هەر جموجۆڵێك بۆ خۆی بکات، یەکسەر دەبێتە هۆی تیرو توانج لێدان.

### ٣٥)- سپی هەڵگەڕا.

بە واتای تێکچوون دێ، دیارە مرۆڤ بەهۆی ئەو خوێنەی کە لەشیدا هەیە جۆرە ڕەنگێك بە دەموچاوی ئەبەخشێ و هەر تێکچوونێکی ناسروشتیش ڕووبدات ئەوا پێوەی دیاردەبێت، زۆر جار لە ترسا، یان لەبەر نەخۆشی، یان لەبەر تەریقی کەسەکە ڕەنگی دەپەڕێو سپی هەڵدەگەڕێ، بۆیە ئەو سپی هەڵگەڕانە بە واتای تێکچوون دێ، ئەو تێکچوونەش بەپێی شوێن و ڕێو ژینگەکە واتاکەی ئەگۆڕێ، ڕاستتر هۆکاری واتاکەی دەگۆڕێ.

**٣٦ )- سپێدەی دا.**

بە واتای دەرکەوتن دێ، هەروەها بە واتای پێش گزنگی خۆرکەوتن دێ، چونکە ئاسۆ سپی هەڵدەگەرێ، واتای یەکەم و دووەم لەم نموونەیەی (نالی)دا بەدەردەکەوێ:-

**لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان[٦١]**

**بەیانی دا سپێدەی باغی سێوان**

**٣٧ )- ئاڵای زەرد.**

بە واتای پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەمەش هەموو ئەو بیرو بۆچوونو بیرۆکانە دەگرێتەوە کە ئەو حزبە بڕوای پێی هەیەو لە هەنگاوەکانیدا پەیڕەوی دەکات.

**٣٨ )- زەردکردن.**

بە واتای نیوە کوڵاندن، لێرەدا دەچێتە ناو بواری لێنانەوە، بۆ نموونە (لۆبیاکە زەرد بکە)، کەواتە نیوە کوڵی بکە، دیارە زەردکردن لە بواری چێشت لێناندا هەموو جۆرە خواردنێك ناگرێتەوە، بەڵکو بۆ: گۆشت، بامێ، پاقلە، لۆبیاو ئەو جۆرە شتانە دێ.

**٣٩ )- زەردبوون.**

ئەم ئیدیەمە بە چەند واتا هاتووە، وەکو:-

**أ- پێگەیشتن، دیارە ئەمەش بۆ هەندێ جۆر لە جۆرەکانی میوەو تەرە دێ، بۆ نموونە:-**

- شەمامەکە زەردبووە. (گەییوە)

(٦١) - مەلا عەبدولکەریم مدرس، دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢٠.

- لیمۆکە زەردبووە. (گەییوەو ئەشێ بخورێت)
- کاڵەگەکە زەردبووە. (گەییوەو ئەشێ بخورێت)
- هەنجیرەکان بە دارەکەوە زەردبوون. (گەییون و ئەشێ بخورێن)

ت- زەردبـوون، بـە واتـای وشـکبوون و نەخۆشـیو مـردن دێ، ئەمـەش بـۆ گەڵاو دارو درەخت بەکاردێو وشەی زەرد واتاکەی گـۆڕاوەو بـۆ مەبەسـتی واتایی کە بەکارهاتووە.

- گەڵای دارەکە زەردبووە. (وشکبووە / مردووە)
- نازانم بۆ چی، شینایییەکەمان زەردبووە؟ (نەخۆش کەوتووە)

**٤٠)- بۆتە زەعفەرانی زەرد.**

**بە ئەندازەیەك سیس و لاوازە خوێن لە دەم و چاویا نەماوە، هەروەها بە واتـای گۆڕینی ڕەنگی کەسەکە دێ، ئەمەش لە حاڵەتی نائاسـاییدا دەبـێ کـە کەسـەکە لەناکاو بە تۆمەتێکەوە بگیرێ یان ئاشکرابێ، وەکو بڵێی:-**

**- یەکسەر ڕەنگی بوو ە زەعفەرانی زەرد.**

کەواتە ڕەنگی تێکچوو، دیارە ئەمـــەش لـەوەوە هـاتووە کـە زەعفـەران خـۆی زەردە، لە ڕێگەی لێکچوواندنەوە ئەم ئیدیەمە لەدایکبووە.

**٤١)- ڕووزەرد.**

بە واتای شەرمەزاری دێ، ئەمەش دەدرێتە پاڵ ئەو کەسانەی ئیشـــوکاری کـەم دەکەن و لە هەڵوێستدا دڵسوز نین، یاخود ئەرکەکانیان بە ڕێکوپێکـی نابەنەسـەرو بە نیوەچڵی بەجێیدەهێڵن، یان بە فرتوفێڵ بەسەری دەبەن، ڕووزەردی زۆر جـار لـە بواری دووعاو نزای نێگەتیفانەدا دەبێ، یان وەکو داخوازی کە تووشـی هەڵوێسـتی وا نەبن کە ڕووزەردی- بە واتای شەرمەزاری لە دوابێ، وەکو:-

**- ڕووزەردی دنیاو قیامەت بی.**

- خوایە ڕووزەردی دنیاو قیامەتمان نەکەی.
نالیش لەم ڕووەوە ئەفەرموێ:-

لە خەوفی تەلعەتی ڕۆژ هەروەکو شێت[٦٢]
بــە ڕووزەردی هــەڵات و کــەوتــە کــێوان

هەروەها جەلیل کاکە وەیس بەو واتایە بەکاریهێناوە، کە دەڵێ:-
**-(بە زەبری خەنجەر کۆرپەی ساوای لە بەر مەمکاو هــەمێز لێ گیراییتــەوەو بە ڕووزەردی ڕەوانەی ماڵەوەیان کرابێتەوە)[٦٣].**

## ٤٢)- ڕەنگ زەرد.

ئەم ئیدیەمە بە واتای نەخۆشی دێ، ئەمەش لەوەوە هاتووە، کە مرۆڤی ناساغ، ڕەنگی زەرد دەبێو تەڕیو شەوقدانەوە لە دەموچاوو لەشیدا نامێنــێ، وەکـو نـالی ئەفەرموێ:-

ئەی خەڵوەتی مورائی، بێ ڕەنگی خود نومائی[٦٤]
ڕەنگ زەردی عاشقی بە، نەك زەرد ڕوو شەقی بە

- ڕەنگ زەردی عاشقی بە = نەخۆشی دەست عەشق بە
- زەرد ڕوو (ڕوو زەرد) = شەرمەزار

## ٤٣)- زەردەی چاو.

بە واتای شتێك بەبەر چاوتەوە بکــرێو دەســەڵاتی ئــەوەت نــەبێ کــە نــەهێڵی بکرێت، ئەمەش زۆرکردن و دەسەڵاتی ئەو کەسە دەگەیەنێ کە کارەکــە دەکـات و

---

(٦٢) - مەلا عەبدولکەریم مدرس، دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢١.

(٦٣) - جەلیل کاکە وەیس، ٢٠٠٠، چرکە زیندووەکان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ل٣٦٣.

(٦٤) - مەلا عەبدولکەریم مدرس، دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢١.

بێ دەسەڵاتیی بەرامبەرەکەشی دەخاتە ڕوو، بـۆ نموونـە دوو فـەلاح لەسـەر چـەن خەتێ زەوی مشتومڕیان بێ، کەچی یەکەم بە دووەم دەڵێ:- وەڵڵاهی وەڵڵاهی، من دەیکێڵم و دەبێ تۆش زەردەی چاوت بێ، کەواتە من زەوییەکە دەکێڵم، دەبێ تۆش لە دوورەوە بێ دەسەڵاتانە سەیری بکەی.

**٤٤)- زەردەکردن.**

**بە واتای تروسکەکردن، ئەمەش بۆ بینینی کەم دێ، بۆ ئەو کەسانە بەکاردێ کە چاویان لەدەستداوە، بەڵام هەر ئەوەتا تروسکەیەك دەکاو ناکا، بۆیە ئەگەر لێی بپرسی:-**

**- چاوت لە چییایە؟ لە وەڵامدا ئەڵێ:-**

**- زەردەیەك ئەکاو ناکا.**

**٤٥)- زەردو سوور.بە واتای ڕەنگاوڕەنگ دێت، هەروەها :**

بە واتای منداڵی وردو جوان، ئەمە لە بواری وەسفکردنی خێزاندا دەبێ، جاری وا هەیە یەکێك دەمرێ، خۆ ئەگەر بپرسن:- ئایا منداڵی هەیە یان نا؟ ئەوا دەکرێ لـە وەڵامدا بوترێ:-

**- پڕ کۆزێ زەردو سووری هەیە.**

**کەواتە کۆمەڵێك منداڵی وردو جوانی هەیە..**

لـێرەدا نـەك تەنـها وشـەی زەرد بـۆ واتـای دی بـەکارهاتووە، بـەڵکو وشـەی (سوور)یش واتاکەی خۆی لەدەست داوەو واتایەکی کە ئەگەیەنێ.

## ٤٦ )- زەردە زیڕە لێدان(٦٥)

بە واتای گریانێکی بێ وچان، لە ئەنجامی ئـــازارێکی زۆر، ئەمــەش لـە بــواری دووعاو نزادا دێ کە لە منالێ بکرێ، وەکو:-

**- دەك زەردە زیڕە لێتدا.**

## ٤٧ )- زەرد هەڵگەڕا.

**ئەم ئیدیەمە بە واتای ڕەنگ تێکچوون دێ، ئەمەش لـــە بــواری شــەرمکردن و ترساندن و خۆشیدا بەرجەستە دەبێ.**

## ٤٨ )- دەمەزەردکردن.

**ئەم ئیدیەمە بەم واتایانە بەکارهاتووە:-**

**أ- تیژکردنەوە، ئەمەش پتر بۆ ئەو کەرەستانە بەکاردێ، کە دەمیان هەیەو بۆ شت بڕین بەکاردەبرێن، وەکو: (چەقۆ، سیکارد، داس، داسولکەو ئەو جۆرە کەرەستانە، بۆ نموونە دەوترێ:-**

**- بەر لەوەی دەسکەنیە درەوکردن دەبێ داسەکان دەمەزردەکەینەوە.**

**- خەنجەری دەبان، دەمەزەردکردنی بۆ چییە؟**

**ب- بە واتای نوێکردنەوە دێ.**

ئەمەش بە کەسێك دەگوترێ کە دەستی بەخۆیا بهێنێو خۆی بــۆ مەبەسـتێکی دیاریکراو ئامادە بکات و سەرلەنوێ بۆی تێهەڵچێتەوە. ئەو کاتە دەڵێی:-

**- خۆی بۆ دەمەزەردکردووە.**

---

(٦٥) - زەردەزیڕە، گەرچی مێروویەکیش هەیە بەم ناوە، چزووی هەیەو پێوە ئەدات، پێوەدانەکەش زۆر بە ئازارە، دەکرێ پەیوەندی لە نێوان ئێشی ئەم مێرووەو گریانەکەدا هەبێ، بەڵام لە ئیدیۆمەکەدا مەبەست لە ناوی مێرووکە نییە، ئەگینا ئەو کاتە دەبێتە ناوێکی لێکدراو.

**٤٩)- تفی زەرد کردن.**

بە واتای ڕق و کینە وەکو لەم نموونەیەدا هاتووە:-

**(ئەوەی ڕۆژی دەیان جار تفی زەردی لێدەکرێ)**(٦٦)

**٥٠)- پەڕۆ زەردکردن.**

**لە ناوچەی هەولێر بە واتای پەڕۆی ڕوو سپێتی دێ، ئەمەش لە بواری دووعاکردنی نێگەتیفانەدا دەبێ بۆ نموونە ئەگەر، هیوای ئەوە بخوازی کە کچێ شوو نەکاو بێنێتەوە پێی دەڵێن (پەڕۆك زەرد نەکەی هەروەها بە واتای خۆ پیسکردن لە ترساندا دێ.**

**٥١)- کفن زەردکردن.**

**بە واتای ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە، بۆ نموونە پاش مردنی کەسێك، برایەکی یان ئەندامێك لە ئەندامانی خێزانەکەی، داوای بەشە مافی خۆی دەکات،** لەو کاتەدا پێی بوترێ:- (هێشتا کفنی زەردنەکردووە)، وا ئێوە کەوتوونەتە مرخ خۆشکردن لە میراتەکەی!)، کەواتە هێشتا زووەو ناشیرینە داوای شتێکی وا دەکەن.

**٥٢)- شین شینکردن.**

بە واتای تازێو شیوەن و گریانی بەکوڵ دێ، وەکو لەم نموونانەدا بەدەردەکەوێ:-

**- شین و شایی بە دەستەوایی**(٦٧).

---

(٦٦) - جەلیل کاکە وەیس، لا٦٦.

- لە سەیری خەستەخانەی عیشق ئەوی سەوزەی کەوا شینە[68].

- لەسەر هەر خەستە دێ یا خوێندنی یاسینە، یاشینە.

## ٥٣ )- شین و ڕۆڕۆکردن.

بە واتای شیوەن و گریانی بەکوڵو دەنگ بەرزکردنەوە، بە مەبەستی هەواڵگەیاندنی بێ ئارامیی دەروون، سەبارەت بە ڕووداوێک دێ، چ کەسی بێ چ گشتی. ئەمەش زیاتر بۆ ڕووداوی دڵتەزێن و مەرگی ئازیزان و زیانی گەورە ڕوو دەدات.

- لە کۆڵانەکەی ئەوسەر، شین و ڕۆڕۆیەکە ئەوسەری دیار نییە!

## ٥٤ )- سەرت شینکەی.

بە واتای کۆستت کەوێو مردووت لێ بمرێ، ئەم ئیدیەمە لە بواری داخوازیکردنی ناخۆشی بۆ بەرامبەر بەکاردەهێنرێ، دەشبێ بە نەرێ بەکاربهێنرێ، وەکو:- (سەرت شین نەکەی)، لە بەکارهێناندا تەنها بۆ منداڵ، چ کوڕ بێ یان کچ، بەکاردێ، بەڵام بۆ گەورە، بە زۆری بۆ مێینە بەکاردێ، زۆر بە دەگمەن بە پیاو ئەوترێ (هەی سەرت شینکەی).

## ٥٥ )- قاپ شین.

بە واتای حولحولیو بێ کەڵك، ئەمەش واتایەکی نێگەتیفانە لە خۆیدا کۆدەکاتەوەو دەدرێتە پاڵ نێرو مێو بۆ کەمکردنەوەی بەرامبەر بەکاردێ.

---

(٦٧) - پەندی کوردی.

(٦٨) - مەلا عەبدولکەریم مدرس، ١٩٨٤، دیوانی مەحوی، ل٢٨٣.

**٥٦ )- شینە دەمارێکی هەیە، شینە دەمارێکی تێدایە.**

کەواتە جۆرە حەزو ئارەزوویەکی هەیە، ئەم ئیدیەمە لە بواری هزرو بیرو لایەنگیریکردندا بەکاردێ، زۆر جار بۆ سەلماندنی تۆمەتێکی دیاریکراو دەبێ، وەکو:-

- فلان کەس سەر بە فلانە لایەنە.
- نەخێر وا نییە.
- ئەوەی من بزانم، شینە دەمارێکی تێدایە، ئەتۆش هەر بڵێ وا نییە.

**٥٧ )- بنێشتە شینەی سەر زاران.**

لە ناوچەی هەولێر ئەم ئیدیەمە بە واتای (زۆر باس دەکرێ) دێ، ئەمەش بەرامبەر بە ئیدیەمی (بنێشتە خۆشە)یە، واتای ئیدیەمەکە بۆ ئەو کەسانە بەکاردەهێنرێ، کە لە ئەنجامی کردەوەیەکەوە، ئیدی ناوی دەکەوێتە ناوانەوە، لە هەموو کۆڕو کۆبوونەوەیەکدا باسی دەکەن، دیارە ئەم باسکردنانەش بەو شێوەیە کاریگەریی نێگەتیفانەی لەسەر کەسێتیو ژیان و پلەوپایەی ئەو کەسە دەبێ.

**٥٨ )- کەپرە شینەی جوولەکە.**

ئەمە لە جەژنێکی جوولەکەکانەوە وەرگیراوە، بەڵام کورد ئەمەی بە واتای ئەو باران بارینە ناوەختەیە کە لە مانگێکی هاوینی ساڵدا دەبارێ، وەهاش باوە کە پیرو پیرێژنان لەم دیاردەیەوە ئیدی بیر لە زستان دەکەنەوەو خەریکی تەقەتکردنی کەرەستەکانی زستان دەبن، بە مەبەستی بەرگریکردن لە سەرماو سۆڵەی زستان.

**٥٩ )- شین هەڵگەڕا.**

بە واتای ڕەنگی کەسەکە یان شتەکە تێکچوو و گۆڕا.

### ٦٠)- شین و مۆر هەڵگەڕاوە/ شین و مۆر بۆتەوە.

بە واتای ڕەنگی کەسەکە یان شتەکە تێکچوو و گۆڕا، ئەمەش ئەدرێتە پاڵ ئەو کەسانەی زوو هەڵدەچن، یان زۆر هەڵدەچن، خۆ ئەگەر بە ڕاددەیەکی بێ ئەندازە تووڕە ببێ ئەوا ئەو کاتە ئەم ئیدیەمە پڕ بە پێستی خۆیەتی پێی بڵێی:- (ئەوە بۆ واخۆت شین و مۆر کردۆتەوە؟)، ئەوا لێرەدا بە واتای (خۆت تووڕەکردووە)دێ.

### ٦١)- پینەی شینی ناوشان.

بە واتای پەڵەی شوورەیی، ئەمەش بەو کەسانە ئەوترێ کە کاری ئابڕوویەرانەو پڕ لە شەرمەزاری ئەنجام ئەدەن، جا بەو کەسانە ئەوترێ (بوونەتە پینەی شینی سەرشان)، کەواتە وەکو ئەو پەڕۆ شینە وایە کە دەکرێتە پینەو بەناو شاندا دەدوورێتەوە، ئەو کاتە ئەو پینەیە بە حوکمی شوێنەکەی و ڕەنگەکەی لە دوورەوەو لەناو خەڵکیدا دیاردەبێ، کەواتە کارەکەی دیارو ئاشکراو شەرمەزارییە، وەکو لەم نموونەیەدا هاتووە:-

- **جارێکی تر خۆی بە گورگان خواردوو نادات و پینە شینکەی ناو شانیشی هەردا دەماڵێت.)**[٦٩]

### ٦٢-قو تووی شین.

بەواتای جوان و سەر مۆر دێ وەکو لەم نموونەیەدا هاتووە:-

**دەمەکەت هەنگوین لە قوتووی شیندا**[٧٠]

**ناردمە خوازبێنی لێم چوون بەقیندا**

---

[٦٩]جەلیل کاکە ویس/سەرچاوەی پێشوو لا٧٢

(٧٠) فۆلکلۆری کوردی.

### ٦٣-ڕوو سوور.

بەواتای سەر بەرزو بەشەرەف دێ،ئەم ئیدیەمە بەزۆری ئەدرێتە پـاڵ ئـافرەت و زۆر کەم ئەدرێتە پاڵ پیاو، کەچی مەحوی ئەلێ:-

**لالە ڕوخسارم لەسایەی ئەشکی خوێنی ڕەنگەوە** (٧١)

**چونکە ڕوو سوورم لەقاپیی عەین و شین قاف و تێ**

### ٦٤- پەڕۆی ڕووسووری.

بەواتای پەڕۆی شەوی بووکێنی دێ کە لە کۆمەڵی کوردەواریدا مایەو نیشـانەی سەربەرزیو شەرەفی بووکەکەو کەس و کارو خێزانەکەیەتی.

### ٦٥-چاوی سوور بووە.

ئەم ئیدیەمە بـەواتای (شـەڕ لـەچاوی دەبـارێ) دێو حـەزی بەکـەتن کردنــەو لەوانەیە خوێن بەر چاوی گرتبێ، کەواتە ئەیەوێ یەکێ بکوژێ، جـاری واش هەیـە بۆ کەسێك بەکار دەهێنرێ کە پاردو ماڵی دنیا هاری کردبــێ وپێــی دەڵێــن (پـارە چاوی سوور کردووە).کەواتە بوغرا بووە.

### ٦٦-سوور کردن.

بەواتای شایی کردن دێ بە تایبەتی لەناوچەی خانەقین و ئەوانەی بە دیـالێکتی لوڕ قسەدەکەن.

### ٦٧-سوور کردنەوە.

**أ-ئەم ئیدیەمە بە واتای پێگەیشتنی خواردن لە ڕێگای هەڵقرچاندنی لـەناو ڕۆنـدا،** لێرەدا ڕەنگ وای کردووە (کــردن) بباتــە نـاو بـواری چێشـت لێنانــەوە سـوور

---

(٧١) مەلا عەبدولکەریم مدرس/دیوانی مەحوی ل٣٢٣.

کردنەوەش بۆ هەموو جۆرە خواردنێك نییە، بەڵكو بەشێکی تایبەت دەگرێتـەوە بۆ نموونە:-

/گۆشت/تەماتە/پیاز/پەتاتە/کوولەکە / هتد

ب-بەواتای بەخێو کردن و تیاخەرجکردن دێ-بۆ نموونە ئەگەر پیاوێك لە منـاڵێکی بێ باوك توورە ببێ،دایکی مناڵەکە ئەگەر هاتە وەڵام و ووتی (بۆ لێـی تـوورە ئەبی، خۆ سوورت نەکردۆتەوە!)

کەواتە خۆ تۆ هیچ ئەرکێکی بە خێوکردنی ئەو منداڵەت لە ئەستۆ نـەگرتووە، بە چ مافێك لێی توورە دەبی؟!

### ٦٨-کەوا سووری بەر لەشکر.

بەو کەسە دەگوترێ کە خۆی لە هەموو شتێکهەڵقورتێنێ و بیەوێ خۆی بکاتـە خاوەنی. دیارە ئەوانەی ئەم کارە دەکەن زۆر خۆیان دەبەنە پێشـەوەو دەیانـەوێ لـە هەموو مەنجەڵێکدا کەوچك بن.

### ٦٩-سوور هەڵگەڕا.

بەواتای شەرم کردن دێ. بەتایبەتی لەو بوارو ژینگانەدا کەدەبنە هـۆی ئـەوەی مرۆڤ شەرم دایبگرێ.

### ٧٠-دەستی بەخوێن سوورە.

کەواتە تاوانبارو پیاو کوژە. ئەمەش دەدرێتە پاڵ ئەو کەسانەی کە چ بە شێوەی ڕاستەو خۆ یان ناڕاستەوخۆ دەبنە هۆی کوشتنی مرۆڤی بێ تاوان.

### ٧١-سوورە.

بەواتای شیوعییە ئەمەش لەرەنگی ئالآی حزبەکەوە هاتووە کـە سـوورە وەکـو دەڵێ: (فلان کەس سەر بە سوورەکانە).

**٧٢-سوور داگیرساوە.**

بەواتای کە شەنگەو تایەکی بەرزی هەیە. ئەمەش لە بــواری نەخۆشــیدا بــەکار دێت.

**٧٣-سوورانەی وەرگرت.**

سوورانە وەرگرتن. بەو پارەو ماڵە دەگوترێ، کە یەکێك لەکەس و کاری بووکــە لەکاتی گواستنەوەی بووکێکدا، خۆی دەکاتە خولە پیزەو ناهێڵێ بووکەکە بکەوێتە ڕێو دەبێتە بەر هەڵستکارو دەست ئەداتە چەك، یان دار، یان چــەقۆ تاشــتێ پــارە نەخەنە قولە مشتێوە، یان پەیمانی دەسێ جلی نەدەنێ، ڕێگا نادات بووکەکە لەماڵ بچێتــە دەرەوە. جــا ئــەو شــتەی کــە وەری دەگــرێ پێــی دەگوتــرێ ســوورانە، بەکردارەکەش ئەگوترێ (سوورانە وەرگرتــن). هــەتا ئــەم ســاڵانەی دوایــش لــەناو کۆمەڵی کوردەواریدا ئەم دەستوورە باو بووە. بۆ ئــەوەی بــەماڵی زاوا بوتــرێ ئــەم ئافرەتە کەسی هەیەو پارێزگاری و پشتگیری دەکات.

**٧٤- پەڕۆ سوور کردن.**

بــەواتای شــووکردنە چونکــە شــەوی بووکێنــی پــەڕۆ ســووردەبێت و دەبێتــە هاوسەری کەسێك.

**٧٥-سوورو سپی.**

ئەم یدیەمە بەواتای جوان بەکار دێ بۆ نموونە ئەگەر بلێـی (منـاڵێکی قەڵـەوی سوورو سپی بەباوەشەوە بوو). ئەوا لێرەدا سووروسپی بـەواتای (جـوان) هـاتووە و هەردوو ووشەکانی ڕەنگ (سوور-سپی) واتاکانی خۆیان لەدەس داوەو کۆی واتـای ڕیزبوونەکەیان بۆتە ئەنجامی لەدایك بوونی واتایەکی نوێ کە (جوان)ی‌یە.

### ٧٦-سەوز.

بەواتای یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دێ، بۆ نموونە کەدەڵێی( دەنگ بـدە بـە سەوز) بەواتای دەنگ بەو حزبە بدە.

### ٧٧-دەستی سەوز دەبێ.

بەواتای پیرۆز دەبێ، ئەمەش لەوەوە هـاتووە کـە ڕەنگـی سـەوز هـی سـەیدەو ئەوانیش شاڵی سەوز دەبەستن، سەیدەکانیش نەوەی پێغەمبەرن و پیرۆزن.
کەواتە دەستی دەبێتە سەید، کە خۆی پیرۆزە، ئەم ئیدیەمەش لەو بوارەدا بەکار دێ کە یەکێك دژایەتی یەکێکی خراپ دەکات، یان لەناوی دەبا ئەوا ئەوکاتە پێـی دەگوترێ:( بڕوابکـە، دەسـتت سـەوز ئـەبێ) کەواتـە لـە بـەر پـیرۆزی کارەکـەت دەستیشت پیرۆز دەبێ.

### ٧٨-سنووقی سەوز.

بەواتای گۆڕستان دێ، کورد دەڵێ:

**سنوقی سەوزی هەمەنی** (٧٢)

**تیایەتی پیرو جوانی**

(٧٢) فۆلکلۆری کوردی

**٧٩-حەبە سەوزەکەی قووت داوە. (٧٢)**(٧٣)

کەواتە بۆتە بەعسیو لەڕیزی ئەواندا کاردەکات، چونکە ئالاَی حزبەکەیان سەوزە.

**٨٠-سەوز هەلگەڕاوە.**

کەواتە بە جۆرێك نەخۆشەکە ڕەنگی تێك چووە مەترسی لیٚ دەکرێ، لێرەدا مەبەستی نەخۆشییەکی تەواو دەگەیەنێ.

**٨١-فلس لە گیرفانیا سەوزەڵە خانمێتی.**

کەواتە خاوەنی یەك فلسێك نییەو گیرفانی بەتاڵە، ئەمانەش بەو کەسە دەس کورت و هەژارانە دەگوترێ کەهیچ شك نابەن و لەسە ڕساجی عەلین.

**٨٢-بەسەوزی خوراوە.**

کەواتە پێشەوەخت خوراوە، ئەمەش بۆ ئەو پارەو پوولە بەکار دێ کە تاوەکو دەگەنە دەستی خاوەنەکەی ئەوا ئەو تەواویشی کردووە بەپشت ئەستووری بەو پارەیەوە دەستی کردۆتە خەرجکردنی و قەرز کردن، کە پارەکەی هاتە دەست خێری لیٚ نابینێو یەکسەر دابەشی دەکات.

**٨٣-شالی سەوزی بەستووە، کەشیدەی سەوزی بەستووە.**

کەواتە ئەو کەسە سەیدە.

---

(٧٣) فتاح مامە علی سەرچاوەی پێشوو لا ٧٢.

## ٨٤-سەر مۆر.

ئەم ئیدیەمە بەواتای بەکار نەهاتوو و دەسکاری نەکراو دێ، ئەمەش لەوەوە هاتووە کە ئەو قوتیو شووشەو تەنەکەو بەرمیلانەی شتیان تێدابووە، کۆمپانیاکە، یان میری، مۆرێکیان لەسەری ئەدا، بۆ ئەوەی دەسکاری نەکرێ و فرت و فێڵی تیا نەکرێ، ئەگەر ئەو مۆرەی پێوە نەمایە، ئەوا دەزانرا کە کەرستەکە جۆرە تەڵەکەبازییەکی لیّ کراوە، بۆ نموونە، پڕکراوەتەوە، یان هی کۆمپانیا سەرەکییەکە نییە.

ئەم بەکار هێنانەش وای کردووە، مۆر واتاکەی بگۆڕێو بەواتای نوێ و بەکار نەهاتوو بەکار ببردرێت، لە بواری کەشدا دێ و واتای دەسکاری نەکراوە دەگەیەنێ.

بۆ نموونە وەکو سیفەتێك بدرێتە پاڵ ئافرەت ئەو کاتە بەواتای ئەوە دێ کە (هێشتا هەر کچە).

## ٨٥-دەرگاکەت مۆر کرێ، دەرگای ماڵەکەت مۆر کرێ.

کەواتە داخرێو نەکرێتەوە، ئەم داخستنەش داخستنێکی ئاسایی نییە، بەڵکو کاری پۆلیس و سەربازو ئاسایشە، ئەمەش بەمەبەستی دەسبەسەرا گرتنی خانوو کەل و پەلی ئەو ناو ماڵو ئەو شوێنە دێ، دیارە گەلیّ هۆکاری جیاهەن کە دەبنە هۆی (ماڵ مۆرکردن). لەوانە خراپەکاری/دزی کردن/ تاوانی گەورە/نەیاری. ئەمانەش وا دەکەن کە حوکمەت قفلیّ لە دەرگای ئەو شوێنە بداتو مۆرێکی تایبەتیشی پێوە بنێ، بۆ ئەوەی نیشانەی بکات، نەکا بەدزییەوە بکرێتەوەو شت و مەکەکانی لیّ دەر بهێنرێن: زۆر جاریش لە ئەنجامی کێشەی ڕامیارییەوە، میری ئەم کارە دژ بەماڵو موڵکی نەیارانی دەکات.

### ٨٦-دمۆرەیە.

کەواتە خێری بە نەوچەوانەوە نییە، ئەم دمۆرەیە دەدرێتە پاڵ ئەو کەسانەی کـە غەڕن و ڕوو لە هەر شوێنێك بکــەن، یـان دەس بدەنەهــەر کارێکــەوە، نــەك هــەر سەرناکەون، بەڵکو زیانیش ئەگەیەنن، بەوکەسانە دەگوترێ (دمۆرە).

### ٨٧-مۆر هەڵگەڕا.

بەواتای لە ئەنجامی نەخۆشی یان ڕووداوێکەوە ڕەنگی گۆڕاوە، بەڵام کە دەڵێــی (مۆر هەڵگەڕاوە). ئەوا بەواتای نەخۆشــیو تێکچــوون دێ، دیــارە دەبــێ ڕەچــاوی ژینگەی ئاخاوتنەکەش بکرێ.

### ٨٨-شین و مۆر هەڵگەڕا.

بۆ ڕوونکردنەوەی واتاکەی بڕوانە ژ (٦٠)

### ٨٩-مۆرکە مۆرکێتی.

بەواتای (مامە حەمەیکردن). ئەمەش بەو کەســانە دەگوتــرێ کــە خۆیــان زۆر دەبەنە پێشەوەو کلکە لەقێ دەکەن، دیارە ئەنجامی ئەو کارەش پــاك نییــە چونکــە کە سێتییەکەی خۆی لە دەس ئەدات و لە پێنــاوی نیــازی تایبەتیشــدا ئــەو کــارە دەکا. گەرچی ژیان هەندە ناهێنێ لەپێناویدا ئەو سیفەتەت پێ بدرێ.

### ٩٠-ماش و برنج.

بەواتای نیوەی سپیو نیوەی ڕەش، بەو کەسانە دەگوترێ کە سەریان سپی بووەو نیشانەی پیری سەری لێ هەڵداون.

## ٩١-خاکی.

بەواتای مرۆڤێك کەسەر لەشت دەرنەکات و لەو بوارەی کە مەبەستە، هەژارو بێ زانیاریو کۆڵەڵەوارو دەسە پارچەبێ، هەروەها بەواتای مرۆڤی سادە دێت، لە فرت و فێڵو تەڵەکە بازییەوەدوورەو لەسەر ڕووی خۆیەتی، ئەم سیفەتە دوولایەنەیە، دەکرێ بۆ مەبەستی گێلی بەکار بهێنرێ، دەشکرێ بەمەبەستی کەسێکی بێ مڵامەت بێت وەکە:-تۆ بۆ ئەوەنە خاکییت؟. بەواتای (ساکارو نەزان)دێ.

## ٩٢- پرتەقاڵی.

**بۆ ئەم واتایانە بەکار دێ:-**

أ- لە سەر یەك ڕاجێگیر نابێو زوو دەیگۆڕێو هاو سەنگی نییە.

وەکو (فلآن کەس تەبیعەتی پرتەقاڵییە) کەواتە هەرکاتەو بەجۆرێکە.

ب-بەواتای، نەزان و ناشارستانی دێ، ئەمەش لە بواری چێژ وەر گرتن لە شت و ئەتەکێتی جل و بەرگ لەبەر کردن و دروستکردنی هارمۆنییەت و گونجاندنی ڕەنگە کاندا بەدەر دەکەوێ. هەر ئەمەش وای کردووە بەو کەسەی جلی ڕەنگاو ڕەنگی نەگونجاو لەبەر بکا پێی بوترێ: (زەوقی پرتەقاڵییە).

## ٩٣-کشمیشی.

ئەم ئیدیەمە لە ڕووی واتاییەوە، هەمان واتاکانی ژ (٩٣-أ-ب) وەردەگرێ و لەگەڵ پرتەقاڵییەکەدا، یەك دەگرنەوە.

## ٩٤-کەری دێز.

ئەم ئیدیەمە بەواتای خرس و لامل دێت، دەدرێتە پاڵ ئەو کەسانەی کە گوێ بۆ قسەی کەس شل ناکەن و خۆشیان سەر لەهیچ شتێ دەرناکەن.

**٩٥-دەمی سوور کردەوە.**

بەواتای ئارایشتی کردووە، چونکە مەرج نییە ڕەنگەکە سووربێ، لەوانەیە ڕەنگێکی کەی بەکار هێنابێ.

**٩٦-بێ ڕەنگ.**

**بەواتای نەخۆشی و بێ توانا، وەکو:-**

**-لەبەر چاوم بێ ڕەنگ دیاری.**

**٩٧-ئەبلەق بوون.**

لەبنەڕەتدا ئەبلەق بەواتای بەڵەك دێ، کەواتە ڕەش و سپی یان هەر ڕەنگێك کە پەڵە پەڵە ڕەشی تێدا بێ، بەڵام کە وەکو ئیدیەم کاردەکات ئەوا ئەم واتایانە دەبەخشێ:-

أ-زەق.-/چاوەکانی ئەبلەق، لەمۆڵەق وەستاون.

ب-دەرپۆقین-/خەریك بوو چاوی ئەبلەق بێ.

**٩٨-ڕەنگ دانەوە.**

ووشەی ڕەنگ بەشداری لە پێکهێنانی ئەم ئیدیەمەدا دەکات، بەواتای:-

أ-کارتێکردن و بەرچاو کەوتنی لە بوارێکدا (إنعكاس) وەکو:-

-دیاردەی لێدان ڕەنگدانەوەی خراپی لەسەر کەسێتی دەبێ.

ب-بەواتای کاڵ بوونەوە دێ وەکو:-

-کراسەکە یەکجار لەئاو هەڵکێشە، باڕەنگ نەداتەوە.

٩٩-ئارەقەی ڕەش و سپی دەرداوە. (كردووە)
ئارەقەی ڕەش و شینی دەرداوە. (كردووە)
ئارەقەی شین و مۆری دەرداوە. (كردووە)

أ-ئەم سێ ئیدیەمە بەیەك واتا دێن ئەویش، ماندوو بوونێكی بێ مەترەفە.
كەواتە لە ڕادەبەدەر ماندوو بووەو، ڕەنگی ئارقــە دەردانەكـەی سروشـتی نییــەو لەبـەر ماندوو بوون گۆڕاوە.

-ئەوە نە ئەسپەكەی تاودابوو، ئارەقەی شین و مۆری دەردابوو.

كەواتە ئەوەنەماندووكراوە لەوانەیە بپسێ.

ب-هەندێ جاریش بۆ مەبەستی زۆر شەرمەزاری دێ:-






**١٠٠-چاو سوور کردنەوە.**

بەواتای خۆ تووڕە کردن و هەڕەشە کردن و ترساندن دێ. دیارە سوور ڕەنگێکی مەترسیدارە، چاویش کە سوور بووەوە تووڕە بوون دەگەیەنێ، تووڕە بوونیش بۆی هەیە کارەساتی دڵتەزێنی لیّ بکەوێتەوە، کەچی ئەم هەموو واتایانە تواونەتەوەو لە واتای ژێرەوەدا دەرناکەون، وەکو دەڵێ:-

-بەچاو سوورکردنەوەیەك دەرم پەڕاند

-چاوم لیٚ سوور مەکەرەوە.

**١٠١-خوم شێوان.**

واتای ئاژاوەو کارەساتی زۆر دەگەیەنێ..ئەمەش لە بواری بەسەرهاتی ناخۆش و ڕووداوی گەورەو تیاچوونی گیانیدا بەکاردێ، هەروەها بۆ قەرەباڵغیەکی بێ سەرو بەرو نارێك دێ، کەکەس بەکەس نەبێو سەرو سیمای ئاژاوەی پێوە دیاربێت.

-ئەوە شایی بوو یان خۆم شێوان بوو؟.

-دەنگ و باسی ئاوایی چییە؟-کورە خۆم شێوانێکە ئەوپەڕی دیار نەبێ.

**١٠٢-ددان لەیەك سپی بوونەوە/دەم لەیەك سپی بوونەوە.**

شەرم نەکردن-دیارە سپی واتای پۆزەتیفی نەبەخشە، خۆ ئەگەر ددان سپی بێ، ئەوا جوانی

**بە خشەو بەشێکە لە پاك و تەمیزی مرۆڤ.**

بەڵام کە دەبنە ئیدیەم، لەم بارەدا واتای پۆزەتیفانە ئەبەخشن و لە واتاکانی خۆیان دوور دەکەونەوەو بەهیچ شێوەیەك ناچنەوەسەر واتا بنجییەکانیان، لێرەدا بەواتای شەرم نەکردن لەیەکدی دێت، ئەمەش لە ئەنجامی زۆر ووتن بەیەك و ڕێز نەگرتن لەو ووتانە.

زۆر ووتنی بێ ڕێز گرتنیش، دەچێتە ناو بواری شەرم نەکردن لەیەکدی و بگرە دەگاتە پلەی زمان درێژیش، لەناو کوردا شەرم کردن لە گەورە، بە سیفەتێکی باش لە قەڵەم ئەدرێ، شەرمکردنێك کە ڕێزگرتن سنووری بێت، نەك لەئەنجامی نەخۆشیی دەروونییەوەی، زۆر جار ئەم ئیدیەمە لەنێوان ژن و مێردا بەکار دێ، لەکاتێکدا ئەگەر زۆر لەگەڵ یەك بلێن، ئەو بلێ سیرو ئەم بلێ پیاز، لەم بارەدا بەو

ژن و مێردە دەگوترێ (دەمیان لەیەك سپی بۆتەوە/ددانیان لەیەك سپی بۆتەوە). کەواتە شەرمیان لەیەك شکاوە وحیساب بۆ ڕێزگرتنی یەکتری ناکەن.

## ١٠٣-ڕەش بوون.

بەواتای لەبەر چاو کەوتن دێ، زۆر جار لەبواری دووعاو نوشتەکردندا بەکاردێ وەکو (دووعایەکی بۆ بکە، لەبەر چاوی ڕەش بێ.) هەروەها لەئەنجامی کارێکی نابەجێوە، دەکرێ کەسێك کەسێکی لەبەرچاو بکەوێو خۆشەویستیوڕێزی، پێشتری لەلا نەمینی، بۆیە دەڵێ:- (لەبەر ئەتواری،لەبەرچاوم ڕەش بووە.)

## ١٠٤-ڕەشکوژی.

بەواتای بەبێ ئاگایی خەڵك کوشتن، دەس نەپاراستن لە کوشتن، ئەمەش بۆ کەسانی تاوانباری گەورەو دەسەڵاتداری دکتاتۆر، کە لەپێناوی خۆیدا، دەس نەپارێزێو ئەوەی بەر دەس بکەوێ لەناوی بدات، ئەمەش سیفەتێکی نێگەتیفانەیە ڕەشکوژی دالدەی کێی داوە؟

## ١٠٥-ڕەشە خێزان.

ماڵو منالی زۆرو بێ سەرو بەر، ئەمەش بەو خێزانانە دەگوترێ کە ژمارەیان زۆربێ بەمەرجێك کەس ئاگای لەوی دی نەبێو گەورەیەکیان نەبێ، کە سەرپەرشتیان بکات و هەریەکەیان بەلای خۆیدا ڕایبکێشێ، بەئەندازەیەك بێ سەرو بەری پێوە دیاربێ، کە شەڕوئاژاوەشیان تێ بکەوێ.

-خوا ڕەشە خێزانی وا بەکەس نەدات.

## ١٠٦-ڕەنگ و ڕوو.

بەواتای خولّق دێ، ئەمەش لەبواری پەیوەندیی نێوان مرۆڤدا بەکاردێ، جا ئـەو پەیوەندییە باش بێ، یان خراپ بێ بۆ نموونە:-

-ڕەنگ و ڕووی لەگەڵما خۆشبوو

-ڕەنگ و ڕووی لەگەڵما خۆش نەبوو.

## ١٠٧- پۆپە سوورکردن.

بەمەبەستی هێلکە کردن دێ، ئەمەش بۆ پەڕەوڵ بەکار دێ، خۆ ئەگەر مریشك پۆپەی سوور هەڵگەڕاو خوێنی تێ زا، ئەوا نیشانەی ئەوەیە کە دەکەوێتــە هێلکـە کردن، بۆیە دەڵێن:-

مریشکەکە پۆپەی سوور کردووە. (مریشکەکەکاتی هێلکەکردنی هاتووە)

## ١٠٨-دوو کەڵە شینکە لەبن کردن.

بەواتای کوشتن دێ، دیارە فیشــەکی چــەکی جـاران، بــەلای چەخماخچییــەکان، بەدەس دادەگیرایەوە، ئەو داگرتنەوانەش لەسەر بناغــەی زانســتی نەبوونــە، بۆیــە لەکاتی تەقاندنی فیشەکێك کەکارخانە نەبووبێ، دەبـــووە چــەق و دووکــەڵی شــین، ئەمەش چۆتە ناو ئیدیەمەوە، هەرکەسێکیش دووکەڵی شینی لەبن هەنگڵ بکرایە، بەواتای کوشتنی دەهات، وەکو لەم نموونەیەدا دەرئەکەوێ:_

-بەسەری برایەتیمان، دووکەڵە شینکەی لەبنکرد!.

## ١٠٩-دەست سپی کردن.

بەواتای پارەدان دێ، یەکێك لە نازناوەکانی پارە، پوولی سپی بـــووە، تەنانــەت لەپەندیشا هاتووە کە دەڵێ. (پـــوولی ســپی، بــۆ ڕۆژی ڕەش)، ئــەم ئیدیەمــە بــەم شێوەیە بەکار هاتووە:-

**-د. .کە بەخۆتاو، دەسمان سپیکە.**

**١١٠-دەنووك سوور.**

بە ئافرەتێك دەگوترێ، کە زۆر بێ شەرم و شکۆبێو ڕەوشتی نزم بێ.

**١١١-دەم زەرد بوون.**

ماندوو بوون، لەئەنجامی زۆر گوتن و سەرزەنشتی کردنی کـە سـێکدا و، گـوێ ڕایەڵی ئامۆژگارییەکان نەکات وەکو:-

**-دەمم زەرد بوو لەگەڵیاو، بەقسەی نەکردم.**

**١١٢-ڕەنگێکی هێناو هەزار ڕەنگی برد.**

بەواتای ترسا، یان شەرمی کرد، لەئەنجامی ئەم کارانەشدا تێك چوو.

# پاشکۆی ژمارە یەك
# فەرهەنگی ووشەکانی رەنگ

- ئەشم = بۆز/بۆر/رەش و سپی/ماش و برنج.
- ئەشم کردنەوە = بۆز کردنەوە/بۆر کردنەوە
- ئەشمی = بە رەنگی ئەشم
- ئەمپەری = پەمەیی تێر

ب-

- بام، بازگ = رەش و سپی
- بازوویی، بازگی = بازگ ئەبڵەق
- بارەش = رەشە با
- بازە = ناوی سەگە
- بازەڵە = شتی بازوو
- باسۆر = نەخۆشییەکی گرانە.
- باڵباز = چەکدارانی میری.(بە ئینزیباتی عەسکەریش)دەگوترا.
- باینجانی = بەرەنگی باینجان/مۆرێکی تاریك.
- باینجانە سوورە = تەماتە
- باینجانە سیاوە = باینجانی رەش
- بەنەوشەیی = بەرەنگی وەنەوشە
- بۆر = خۆڵە مێشی

- بۆر باو = ئامال بۆر
- بلووری = سپی وەکو کوتاڵی بلووری
- بۆر چێل = ڕەشی ئامال بۆر.
- بە سۆرە = ناوی گیایە
- بۆرمس = بزنە بۆری هەمس/ڕەشی ئامال سپی.
- بۆرە = ئەسپی خاڵ خاڵ ڕەش و سپی، (ئەسپە بۆرە)
- بۆرینە = قەلە باجکە.
- بۆرە سوار = سواری ئەسپی بۆرە (وەکو ئیدیەم دێ بەواتای نەناسراو)
- بۆرە بنار = دەمە قاڵ/چەنە چەن.
- بۆرە پیاو بۆرە زەلام = پیاوی نەناسراو/پیاوی گز گل
- بۆرە جرە = ناوی باڵندەیەکی بچووکە
- بۆرە قانی = گیایەکی کێوییە/سوور دەکرێتەوەو دەخورێ
- بۆرە قنە = ئامال بۆر
- بەرفین = سپی وەکو بەفر (ك-س)
- بۆزەك = باڵندەیەکی بۆرە/ناوی خواردنێکە
- بۆرەکی ناوی تیرەیەکی کوردە/ئامال بۆر
- بۆری = سەبارەت بەبۆر
- برشانی = بەڵەك
- بۆز = شینی ئامال سپی،(مووی سەرو ڕیشی ماش و برنج)
- بۆزە = شینی ئامال سپی

- بەد ڕەنگ = ناشرین/خراپ
- بەخت ڕەش = چارە ڕەش (خراپ) بێ شانس
- بەردە مۆر = ئەو بەردەی نوێـــژی لـــە ســـەر دەكـــرێ (توریـــەی شیعەكان)
- بەر سورکە = سیسارکە سوورەی ناو ماڵ
- بەرقەم = ڕەنگی سووری تەلّخ
- بزنە كەژ = سپی ئامال زەرد
- بەڵەك پڕوێن = ڕەنگاو ڕەنگ
- بەڵەكی = سەبارەت بەبەڵەك(نەخۆشی پێست)(بهاق)
- بەڵەك بردن = ڕەنگكرون
- بڵچە زەردە = گێوژە زەردە
- بڵچە سۆرە = گێوژە سۆرە
- بێز = ڕەنگ
- بێزی ڕەش = گەنمە ڕەش
- بێماو = ڕەنگ و ڕوو ناخۆش
- بەلە ڕەش بەش = بزنی گوێ شۆری ناوچەوان سپی (قەش)
- بەلەسەر بەڵەك = مەری گوێ شۆری سپی خاڵ ڕەش.
- بەلە سەرشینبە لەك = مەرِی گوێ شۆڕ/لەشی بەڵەكەو ملی كەوەیە
- بەلە سپی = بزنی گوێ قوت و سەر سپی
- بەلە سەر ڕەش = مەری گوێ شۆڕ سەرو مل بازگ
- بەلە سوور = بزنی گوێ قوتی لەش و سەر خەنەیی
- بەلە سۆر بەش = بزنی ڕەشی قەش و گوێ ڕاست

- بەلە شین = بزنی سەرو لەش شین و گوێ لوول و ڕاست
- بەلە شین بەش = بزنی شینی قەشی گوێ ڕاست و لوول
- بەلە شین بۆر بەڵەك = مەڕە بۆری بەپەڵەی سەرو گوێ
- بەلە شین ڕەشبەڵەك = مەڕی ڕەشی خاڵدار و نێوچەوان سپیو سەرگوێ شین و گوێ شۆڕ
- بەلە قوڵە = گیسك و كارو بزن و تەگەی گوێ ڕەشی ڕاست و قوت
- بەلە قوڵە بەڵەك = مەڕی سەرو گەردن سووری گوێ قوت (كەڕی)
- بەر بەڵەك = ئاژەڵی دووڕەنگ/ پەڵە پەڵە
- بەڵەكچاو = چاوی ڕەش و گەورەو جوان
- بەنەفشی = وەنەوشەیی/بەرەنگی گوڵی وەنەوشەی مۆر
- بەفرە شینكە = بەورە شینكە/ناوی باڵندە/ جۆرە برینێكە
- بیژی ڕەش = گەنمی ڕەشگوڵ
- بەلە بۆر = مەڕی سەرو لەش بۆری گوێ شۆڕ
- بەلە تاڵە بۆر = مەڕی لەش بۆری بەخاڵ
- بەلە تاڵە ڕەشبەڵەك = لەشی بەڵەك و سەری ڕەش و گوێ درێژو لوول
- بەلەتاڵە سوور بەڵەك = سووری پەڵە سپی گوێ لوول و درێژ
- بەلە تاڵە شینبۆر = مەڕی لەش بۆرو پەڵەی شین و سووری تێدابێ، گوێی لوول و درێژبێ

- بەڵــــە تاڵــــە شێرەش = مەڕی ڕەشی پەڵەی شین یــا ســووری تێــدا بــێو گوێی لوول و شۆربی
- بەڵــــە تاڵــــە شینسپی = مەڕی سپیو پەڵە شــین و ســوورو گــوێ لــوول و شۆڕ
- بەڵە تاڵە شینی سوور = مەڕی سووری بەڵەك شین و سووری گوێ لــوول و شۆڕ
- بەڵـە تەبـــەش بەڵەك = مەڕی سپی بەڵەك سوور یا ڕەش تاتەوقی سەری وگوێیەکانی قیت و لوول بی
- بەلە تەو بەڵەك = مەڕی سەرو لەش سپی پەڵــەی تێدابــێو گوێــی درێژو لوول بێ
- بەلە ڕەش = بـزن و کیســك و تەگــەی ســەرتاپە ڕەش گـــوێ درێژوو لوول
- بێ ڕەنگ = ڕەنگ پەڕیوو/ نەخۆش

پ

- پتخی = بێ ڕەنگ، ڕەنگ پەڕیو
- پرتەقاڵی = بەڕەنگی پرتەقاڵ،(زەردی ئامال سوور)
- پڵ = پەڵەی پێست
- پلپلی = پەڵەی پێست
- پنت = پەڵەی بچووك
- پتۆ = پەڵەی بچووك
- پنۆك پنۆك = خاڵخاڵ
- پوولە زەرتکە = پوولەکەی لەزەرتك دروستکراو
- پەز زەرتکە = مەڕی سپیی گەردن ڕەش

- پەر = مەری دەم و چاو سپی
- پەلکە ڕەنگینە / پەلکە زێرینە = کۆلکە زێڕینە/پرچی ئایشەو فاتمەکەسك و سۆر
- پەڵە = لەکە، پارچەیەکی ڕەنگ جیا/پەڵە هەور
- پەڵاوی = پەڵە پەڵە
- پەڵە دار = شتێك پەڵەی پێوەبێ
- پەلە سۆرك = گەڵای زەرد هەڵگەڕاو
- پنج و مۆر = بەند کراوی ماڵی/نەهاتنە دەرەوە
- پۆپە ڕەشە = نەخۆشییەکە تووشی پەرەوڵ دەبێ
- پەمەیی/پەمەر = چیرەیی/سووری زۆر کاڵ
- پەنی = لەکەی پێست
- پیازی = بەرەنگی پیاز
- پیرۆزەیی = شین بەرەنگی پیرۆزە
- پیسە = بازوو/ دوورەنگ
- پشتێن سەوز = سەید
- پۆپە سوورکردن = دەمی هێلکە کردنی مریشك
- پۆپ سپی (چەرمو) = بەتەمەن/ گەورە
- پووشەو بوون = ڕەنگ گۆڕان
- پووستی = بۆری
- پیلا ڕەش = جەرگ
- پیلا سپی = سییەکان

- پاتە ڕەش = سپل (ك-س)
- پەرەسێلکە سینگ سۆر = پەرەسێلکە (ك-س)
- پەشاڕەش = سپڵ (ك-س)
- بێ کەسك = گیایەکە دەخورێ (ك-س)
- پیسۆر = باسور (ك-س)
- پۆش = بزنی ڕەش (ك-س)

## ت

- تاپۆ = تارمایی/ ڕەشایی لە دوو را
- تارمایی = ڕەشایی
- تاری = ڕەش و تاریك
- تاریك = ڕەشایی/ زۆر تۆخ
- تاریکان = سەرەتای شەو داهاتن/ئێوارەیەکی درەنگ
- تاریکایی = ڕەشایی شەو/ ڕەشایی بێ ڕۆناکی
- تاریك بوون = ڕەشهەڵگەڕانی دونیا
- تاریك و تنۆك = زۆر تاریك
- تاریك و نووتەك = زۆر تاریك
- تاریك و ڕوونی = نێوان تاریکی و ڕووناکی/دەمە دەمی بەیان/ دەمە دەمی شەو داهاتن
- تاریك و ڕوون = سپێدە/ دەمە دەمی شەو هاتن
- تاریك و لێڵ = تاریك و ڕوون

- تاریکە = ڕەش و تاری
- تاریکە شەو = شەوێك مانگە شەو نەبێ/یان ئەستێرەش دەرنەکەوێ
- تاریکە = سەبارەت بەتاریك/ڕەشاییەك لەئەنجامەیی ڕووناکییەوە
- تافەڕەش = ڕەشکەو پێشکەی چاو
- تفە سیاوێ = شاتووی ڕەش
- تلّخ /تەلّخ = ڕەشی ئامال زەرد/شێلوو/ڕەشی ئامال خۆڵە مێشی
- تیت = سۆری کاڵ
- تۆخ = تێر ڕەنگ (تورکییە)
- توولە سەوز = گیایەکی بەژن بلّندە/ بەرەکەی لە گوێز دەچی
- تووە ڕەشە = جۆرێکە لەترێ
- تووە ڕەشە = شاتووی ڕەش
- تەبەش = ئاژەڵی ڕەشی ناوچەوان سپی
- تەنوورە سوورە = یارییەکی کوردەوارییە/ئایشەبە تەنوورە
- تەبڕەش = فێلباز/تەڵەکەباز
- تەختە ڕەش = دەپە ڕەش،(سەبوورە)
- تەرجسە = شین هەڵگەرانی لەش، لە ئەنجامی شت بەرکەوتنی.
- تەڕە پیاز = پیازی سەوز بەگەڵاکەیەوە

